# بڕیار

لە پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

88

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی
مرۆیی لە کوردستاندا

سالّی هەشتەم
تشرینی یەکەمی ٢٠١٥

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی







## لە چاوەڕوانی تۆدا!

## لە کرێکارییەوە بۆ مامۆستای زانکۆ...!

## تۆ کە خوێندکاریت کەواتە: خوێنەر بە!

## 12 ئامۆژگاری بۆ ئەوەی ببیتە داهێنەر


له هیچ کارێکتدا
بێهیوا مەبە؛
چونکە ڕۆژانە،
ملیۆنان موعجیزە لە جیهاندا
ڕوو دەدەن!
RASAN
Group

No: 88

تشرینی یەکەمی
2015

خاوەنی ئیمتیاز
ئەندازیار:
سعوود تــاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر
عادل محەممەد شێخانی
sarnosar@yahoo.co

بەڕێوەبەری نووسین
بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران
ئەسکەندەر ڕەحیم
بێگەرد فــارس
زاهیــــر زانــا
گوڵان حەمەئەمین
محەممەد مێرگەیی
محەممــەد هاشــم
وەهــاب حەسـیب
یەحیــا محەممەد

ڕاوێژکاری یاسایی
پارێزەر: ئازاد محێدین

بەشی هونەریو دیزاین
پشتیوان عبدالرحمن

تایپ
کەلسوم جەلال

ناونیشانی گۆڤار
سلێمانی: شەقامی سالم -
تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی چوارەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢
هەولێر: ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥ - ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine
bryarmagazin@gmail.com

چاپ: پیرەمێرد
دابەشکردن: پەیك/ 07708649210
نرخ: 2500 دینار




# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی هەشتەم - ژمارە 88 - تشرینی یەکەمی 2015










## کارگێڕیو بازاڕسازی



# خۆت نەخشەی ئایندەت بکێشە!

ڕۆژگار هەرچۆن بێت، بارودۆخ هەرچەندە دژواربێت، کێشە ئابووریو ڕامیارییەکان چارەسەر بکرێن، یان نا! ژیان هەر تێدەپەڕێتو میلی کاتژمێرەکەت لە خولانەوە ناوەستێت!

بە تەنها چارەنووسی خۆشت، خۆت دیاری دەکەیتو جڵەوی ژیانت بە دەست خۆتەوەیە، ئەگەر بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بیر بکەیتەوە!

ئەوەی دەتوانێت، ئایندەت بنیات بنێت، تەنها خۆتی!

ئەگەر پێشت خۆشە، بزانی ئایندەت چۆن دەبێت، لە ئێستاوە دەست بە دروستکردنی بکە!

هەوڵ بدە بۆ گەیشتن بەو ئایندەیەی دەتەوێت، خۆت ئامادە بکەو بە باشترین شێوە بیر بکەرەوە، ژیریو بیرکردنەوەو ڕوانینت بۆ کارەکان، هۆکاری سەرەکیی ئاراستەکردنی تۆن!

بە شێوازێکی ئەرێنیو گەشبینانە، بیر بکەرەوەو مەهێڵە هیچ بەربەستێك ساردت بکاتەوە، یان ئاڕاستەت پێ بگۆڕێت!

تۆ ملی ڕێگا بگرەو بەرەو بەدیهێنانی خەونەکانت هەنگاو بنێ، دڵنیات دەکەم، ئەنجامی زۆر چاوەڕواننەکراوو سەرسوڕهێنەر دەبینی!

ئەوەش بزانە کە ئەو سنوورانەی دەبنە بەربەست، هێندەی لە ناخی خۆتەوە سەرچاوە وەردەگرن، ئەوەندە دەرەکی نین!

گوێ بۆ ئەگەرو ناکرێو زەحمەتەو چۆن دەبێت، مەگرە!

چاوەڕوانی کەس مەکەو سوود لە دەوروبەرتو ئەو شتانە وەربگرە، کە لە بەردەستدان!

هەرئێستا لیستی خەونەکانت تۆمار بکە!

هەرئێستا لیستی ئامانجەکانت تۆمار بکە!

ئایا دەزانیت کە ٩٧٪ی خەڵکی، هیچ ئامانجێکی تۆمارکراویان نییە!؟

ئەوانەی کە ئامانجەکانیان دەنووسن، دواتریش پێی دەگەن، تەنها ٣٪ی خەڵکین!!

بێگومان تۆ دەتەوێت لەبەشی دووەم بیت!

کەواتە: مەبەستت دیاری بکەو پلان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت دابڕێژە.

هەر ئەمڕۆش دەست بە جێبەجێکردنی پلانەکەت بکە!

بۆ سەرکەوتنت لەم ڕێگایەدا، زانیاریەکانت فراوانتر بکە، پەرە بە خۆت بدە، پەرە بە بیرکردنەوەو شێوازەکانی بدە! بزانە سەرکەوتووەکان چۆن بیر دەکەنەوە!

سەرکەوتن کارێکی ئاسانە، گەیشتن بە خەونو ئاواتەکانت ئەستەم نییە!

پێویست ناکات بۆئەوەی بگەی بە سەرکەوتن، کەسێکی زۆر لێهاتوو عەبقەری بیت!

ئەوانەی گەیشتنە لوتکەی سەرکەوتن، مرۆڤگەلێکی ئاسایی بوون! تەنها بڕیاردانو نووسینەوەی ئامانجەکانو دانانی پلان، گەورەترین لێهاتوویيو بوێریو ئازایەتییە!

پرۆگرامسازیی مێشکت بکە لەسەر سەرکەوتن، هەموو بیرۆکەیەکی نەرێنیو ڕەشبینییەك بسڕەوە!

بخوێنەوە، لە دەریای خوێندنەوەدا، دەگەیتە هەموو گەوهەرەکانی ژیانو ژیانی مرۆڤە سەرکەوتووەکان بخوێنەوە، ئەوسا دەزانی ژیان گەمە نییەو کۆمەڵە ڕووداوێکی بێ سەرەوبەرە نییە!

دەزانیت کەسە بەختەوەرەکان لە ژیاندا، ئەوانەن کە ئامانجی ڕاستەقینەیان هەیەو دەزانن چی دەکەنو بۆ کوێ دەچن!

تۆ کاتێك دەگەیت بەو شتانەی کە دەتەوێت، کە کاریان بۆ بکەیتو هەوڵیان بۆ بدەیت!

هەمیشە ئەوەشت لەیاد بێت، کە تۆ بەو شتانە دەگەیت کە شایانی تۆن، نەك ئەو شتانەی تەنها حەزەکانی تۆن!

بڕوات بە تواناکانی خۆت هەبێتو ئەوەندە لە خۆت ڕاببینە، کە تەنها خۆت بەرپرسیاری لە هەموو ڕووداوەکانی ژیانت!

خۆت دەتوانی تابلۆی داهاتووت بکێشی!

چیدی بە دیار هەواڵو سیاسەتو شەرەقسەی مرۆڤە بیرکورتە زماندرێژەکانەوە دامەنیشە!

هەر ڕۆژەو سووچێکی ئەو تابلۆیەت بکێشە، کە خەونی پێوە دەبینی، ببە بە هاوڕێی مرۆڤە خاوەن ئامانجو هیواو ئاواتە بەرزەکان!

دوا وتەشم ئەوەیە، کە ئەمڕۆ بکەی بە یەکەم ڕۆژی دانانی پلان بۆ سەرکەوتن!

وریابە، شکستهێنان لە پلاندانان بۆ ئاینده، پلاندانانە بۆ شکست!

بەڵام من دڵنیام پێش خوێندنەوەی دوا وشەی یەکەم دڵۆپ، بە شوێن پێنووسو پەڕوایێکدا دەگەڕێی؛ تا نەخشەی ئایندەت بکێشی!

ئەو ڕۆژەش نزیکە، کە بۆت دەربکەوێت چەند ئەندازیارێکی بلیمەتیت!!



# کارگێڕی بە گوفتار

دوودڵی: گەورەترین کۆسپو تەگەرەو بەربەستی بەردەم سەرکەوتنە.

عومەر موختار

ئەوانەی زۆر حەز لە خواردن دەکەن، ئەوانەشی کە زۆر حەز لە خەو دەکەن، ناتوانن کاری گەورە ئەنجام بدەن.

پاشا هێنری چوارەم

هیچ شتێک بە ئەندازەی ئازارێکی گەورە، نامانکات بە کەسێکی گەورە.

ئەحمەد ئەمین

لە جیهاندا، هیچ سەڕینێک، لە باوەشی دایک نەرمتر نییە.

شکسپیر

درەنگ گەیشتن، باشترە لە هەرنەگەیشتن.

پەندێکی تورکی

کارگێڕی بە چیرۆك

# قاوەکەی دایکم!

شاعیری فەلەستینی بەناوبانگ: مەحموود دەروێش دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەو کاتەی لە زینداندا بووم، دایکم سەردانی کردمو میوەو قاوەی بۆ هێنابووم، هەرگیز خەمی تاڵی نێو ڕوخساری دایکم لەیاد ناچێت، کاتێك پاسەوانەکە، قۆریی قاوەکەی زەوت کردو ڕژاندی بەسەر زەوییەکەدا، هەرگیز فرمێسکەکانی چاوانیم لەیاد ناچێت، لەبەرئەوەش بوو، داوای لێبوردنێکی تایبەتیم بۆ نووسی لە زینداناو لەسەر ڕووپەڕی پاکەتە جگەرەیەکم تۆمار کردو بۆم نارد!

تیایدا دەڵێم: بە تاسەی نانی دایکمو قاوەی دایکمو ئامێزی دایکمم، منداڵیم گەورە دەبێت، لەسەر سینگی ڕۆژێکم، عاشقی تەمەنی خۆمم؛ چونکە ئەگەر مردم، شەرمەزار دەبم لە فرمێسکەکانی دایکم.

دەروێش دەڵێت: وام دەزانی ئەم داوای لێبوردنە شتێکی تایبەتەو لە کوڕێکەوە بۆ دایکی، نەمدەزانی ئەم وشانە دەبنە گۆرانیو ملیۆنان منداڵی گەلەکەم دەیچڕێ.

لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:

١- سۆزو خۆشەویستیو ڕێزو وەفا، کەلێنێکی گرنگی ژیانی مرۆڤن، مرۆڤی سەرکەوتوو، هەرگیز لەیادی ناکات.

٢- ئەمڕۆ لە زانستی بەڕێوەبردنو کارگێڕیدا لقێکی سەربەخۆمان هەیە، تایبەت بە بەڕێوەبردنی هەستو سۆز "إدارة المشاعر"

٣- تۆمارکردنی ساتو هەستو نەست، گرنگە بۆ پارێزگاری لێکردنو یاداشتکردنو گواستنەوەی بۆ نەوەکانی داهاتوو!

٤- دایك مرۆڤێکی گەورەیە، گەر نووسەرو ئەدیبێك خامەکەی نەکاتە خزمەتی دایکی، ئەوا گەورەترین سەرچاوەی ئیلهامو شیعرو ئەدەبی فەرامۆش کردووە.

٥- لە کاتی خۆیدا، گوزارش لە هەستت بکە بەرامبەر کەسانی دەوروبەرت؛ چونکە ئەوان هەمیشە لە چاوەڕوانیی کاردانەوەی تۆدان.

٦- ئەم شیعرە، چونکە هەڵقوڵاوی هەستێکی پاکو سۆزێکی ڕاستەقینە بوو، بوو بە داوای لێبوردنێکی نەمرو هەرکە باسی دایك دەکرێت، شیعری "أحِنُّ إلَى خُبزِ أُمّي وَقَهوةِ أُمّي" ئامادەیە.

٧- مرۆڤە گەورەکان بۆ هەتاهەتایە، بۆنی نانی دایکو بەرۆکی دایکو ئامێزی دایکییان، لەیاد ناکەن!





# تەنها بۆ سەرکردەکان

سەرکردە ئەو کەسەیە، کە سەرکردە درووست بکات، نەک شوێنکەوتوو زیاد بکات!

بەبێ تێپەڕبوون بە وێستگەکانی ماندووبوون و شکست و بێهیوایی، مرۆڤ بە باخچەی سەرکەوتن ناگات، خاوەنویست و ئیرادەکانیش، لەو وێستگانەدا، درێژە بە ڕاوەستان نادەن!

ئەگەر ویستت بگەیتە سەرلوتکەیەک، کە هیچ کەس پێش تۆ، پێی نەگەیشتووە؛ ئەوا ڕێگەیەک بگرە بەر، کە هیچ کەس پێش تۆ، نەیگرتووەتە بەر. (فرانسیس بیکۆن)

نابیت بە کەسێکی گەورەو سەرکردەیەکی بەهێز، ئەگەر بەردەوام بیروهۆشت بە شتە بچووک و لاوەکییەکانەوە سەرقاڵ بکەیت!
(فرانسوا دی لا روچیفوکالد)

خەڵکی دەزانن چۆن بجەنگن، بەڵام نازانن چۆن پلان بۆ سەرکەوتن دابنێن.
(سون تسو)




# ئەو کارانەی نابێت لە سەرەتای دەستبەکاربوونتدا، ئەنجامیان بدەیت

### قسە بجوو، ئینجا بیدوو

بە بوونی ژمارەیەکی زۆر لە کارمەندان، کە بۆ هەر وشەو وتەیەك دەیڵێیت، گوێ ڕادەگرن.. لەبیرکردنو لەبیرخۆبردنەوەت لا ئاسان دەبێت، ڕەنگە ئەوان لەبەر دەسەڵاتت بەسەریانەوە، نەك لەبەر زیرەکیو بەتواناییو لێوەشاوەییت، بەدەم داواکانتەوە بێنو ڕازی بن. هەمدیسان هاسانە گوێڕاگرتنو گوێڕایەڵییان، بەتایبەتی کە یەکەم جار تووڕە دەبیت، بەلاڕێتدا ببەنو سەرت لێ بشێوێنن.
با لە سەرەتادا، قسەو باسەکانت، لەسەر بارودۆخە زۆر پێوستەکان بێتو بەس؛ چونکە هەم ژێردەسەکانت، هەم سەرۆکەکانت، تەواوی ئەو کردارە نابەرپرسو خەمساردانەی لێت دەردەکەون، تۆماری دەکەنو لای خۆیان هەڵی دەگرن. ئەم کردارانە، زۆرجار لای کەسانی دیکە، دەبن بە بەشێك لە ڕەنگوڕووی تۆ. لەوانەیە ئاکامو دەرهاویشتەکانیان درێژە بکێشنو بڕانەوەو دوایبهاتنیان بۆ نەبێت. دووبارە دەڵێین: قسە بجوو، ئینجا بیدوو، بیر بکەرەوە، ئینجا بدوێ!

### لە ئاستی کاردا، ئاستەنگ مەبە

وشەی باو، بۆ ئەم دەستەواژەو دەربڕینە، بریتییە لە: «دەسەڵاتپێدان». وا خۆت دەبینیتەوە، کە هەوڵ دەدەیت، گشت شتێك ئەنجام بدەیت. ڕێی تێ دەچێت بەهۆی شڵەژاویو ڕاڕایی، کەمیی ئەزموونو شارەزاییەوە بێت، یان ڕێكو ڕەوانتر بڵێین: متمانە بە یاریدەرەکانت ناکەیت. ئیدی زۆر بەخێرایی، چەندان لە نووسراوو یاداشت، وەك مەڵۆو خەرمان، لە نووسینگەکەتدا بەرچاو دەکەون، چاوەڕێی واژۆو پشتگیرین. ئەمە جگە لەوەی بڕیارە بەجێو لەجێیەکان، دوا دەکەونو کارەکان بەسەر یەکدا کەڵەکە دەبن، تا وای لێ دێت، شێوازی کارگێڕیو هەڵسووڕاندانی کاروبارەکەت لە فەرمانگە، یان لە کۆمپانیادا، وەك ملەی بوتڵی شووشەی لێ دێت، لە تەسکیدا.
ئەمە بە تەنها کێشەی تۆ نییە؛ چونکە هەر بەڕێوەبەرێك بگریت، دڵی بە لای کارەکەی خۆیەتیو بۆی بەخەمە، هەستێکی پڕبەرپرسیارێتی بەجۆرێك دای دەگرێت، وا دێتە بەر چاوی، کە ئیشو کار، بۆ خۆی بەئەنجامی بگەیەنێت، ئاسانترو بەسوودترە، لەچاو ئەوەی کەسانی دیکە، فێری چۆنێتیی بەئەنجاگەیاندنەکەی بکات، بەڵام دەبێت، وەك بەڕێوەبەرێك باش بزانیت: ڕاهێنان، یان مەشقپێکردنو دەسەڵاتپێدانو ئەرکسپاردن، لە گرنگترین بەرپرسیارێتیو ئەرکەکانتە، بە فەرامۆشکردنیشیان، لە کارەساتو فەتارەت نزیك دەکەویتەوە.

### لە بەرپرسیارێتی ڕامەکەو خۆت مەدزەرەوە

لە گرنگترین بنەماکانی کارگێڕی ئەوەیە: بەرپرسیارێتیی هەڵەکان لەئەستۆ بگریت. واتە: هەڵەکان ببەیتەوە سەر خۆتو خۆت خەتابار بکەیت، هەروەها دەسکەوتو کارە سەرکەوتووەکانیش بدەیتە پاڵ یاریدەرەکانتو بە هیی ئەوانی بزانیت؛ چونکە ئەو بەڕێوەبەرەی هەوڵ دەدات، کەسانی دیکە، سەرزەنشتو سەرکۆنە بکاتو ئۆباڵو بەرپرسیارێتیی هەڵەکانیان، لەگەردنیان بئالێنێتو بیخاتە سەر شانی ئەوان، ئەوا نەك هەر متمانەی ئەوان پێی نادۆڕێنێت، بگرە ئەو ڕێزەشی کە ئەوان لێی دەگرن، بەبای دەداتو دەیکات بە تۆزی بانان.
بەدڵنیاییەوە، دڵسۆزیو پاکی، چەکێکی دووسەرەیە، لەبەر ئەوە، دەبێت هەردەم ئەم وتەیەت لەبیر بێت: هەرچی خێروبێرو چاکەیە، هەموان دەگرێتەوە، شەڕوشۆڕو خراپەش، یەخەگیری کەسێك دەبێت.



نووسینی: عبدالله العثمان
و: جەلال عەبدوڵلا حاجی

# کاری کەمو ئەنجامی مەزن
# ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە..

**١- کاتژمێرێــك زانین = چەندین کاتژمێر دوورکەوتنەوە لە دڵتەنگی:**

شــارەزایانی کارگێڕی دەڵێن: (کاتژمێرێك پلاندانان، (٨٠٪) کاتمان بۆ دەگێڕێتەوە لەکاتی ئەنجامداندا)، کاتێك پلان دادەنێیت، ڕەزیلــی لــە کات مەکــە؛ چونکە دواتــر کاتت بــۆ دەگەڕێتەوە، پەندێــك هەیە دەڵێــت: (ئەگەر لە پلاندا ســەرنەکەوتیت؛ ئەوا پلانت بۆ شکســت داناوە)، لە شــەڕی خەندەقدا، موسوڵمانەکان پلانی باشــیان هەبــوو، ئامادەبــوون بۆیە توانییــان بەرەنگاری هــەزاران کەس ببنــەوە، عەمری کوڕی عــاص لەگەڵ یەکێك لە کەتیبەکاندا لەشــەودا دەجووڵان، بە بێ ئەوەی ئاگر بکەنەوە، تا پەلاماری دوژمنیاندا، بە پلاندانان کاتو تواناو پارەی زۆرمان بۆ دەگەڕێتەوەو زەرەرێکی کەم دەکەین، کاتژمێرێك پلاندانان، واتە: دوورکەوتنەوەی چەندین کاتژمێر لە شکست، کاتژمێرێك زانین، واتە: دوورکەوتنەوە لە چەندان کاتژمێر خەم.

**٢- بەگوێرەی بەهاکانت کاربکە:**

زۆر کەس نازانن بۆ ئەو کارە دەکەن، کە دەیکەن، دۆزینەوەی ئەو بەهایانەی کە پێویستو بنەڕەتیو سەرەکیو گرنگن، کاتێکی زۆرمــان پــێ دەدەن، لە کاتێکــدا کارێك دەکەیت خۆشــیت لێی نایــەت؛ ئەوا تــۆ کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت، ئەوەی پەســەندە لای تۆو بەرێزەوە ســەیری دەکەیت، ئەوە لەژیانی تۆدا بەگرنگ دەردەکەوێــت. لــە بەهــا گرنگەکانی ژیانت، (١٠) دانە بنووســە، وەك: خۆشەویســتی، لێبووردەیــی، ئاییــن، داهێنــان، ئــازادی، بەخشــین، پەیوەندی، تەندرووستی، چێژ، هێز، خۆشی، ئینتیما، سپاردە(ئەمانەت)، هەوڵ بدە گرنگییەکەی لای خۆت بدۆزیتەوە، چــی دەبێــت بەهــۆی تێربوونــی، پاشــان کار بکە بــەوەی کە نووســیوتە بۆ تێرکردنی، دەبینیت ژیانت پڕ دەبێت لە خۆشیو خۆشەویستیو دڵارامی.

**٣- زیاتری پێ بدە:**

دەبێت پارەی زیاتر بدەیت؛ بۆئەوەی زیاترت دەست بکەوێت، ئۆتۆمبێلــی نوێ بکڕە لەجیاتی ئــەوەی ئۆتۆمبێلی کۆن بکڕیتو پارەیەکی زیاتر لە نرخەکەی خەرج بکەیت بۆ چاککردنەوەی، یان هەموو ڕۆژێك چاکی بکەیتەوە، ئەمەش بەفیڕۆدانی کاتو تواناو پارەیە، مرۆڤ دەبێت زیاتر بدات؛ بۆئەوەی جۆری باشتری دەست بکەوێت، لەداهاتوودا سوودی دەبێتو باشترە، نابێت هەمووشتێك پارەی زۆری پێ بدرێت، بەڵکو ئەوشــتانەی کە ماوەیەکی زۆرتر دەمێننەوە، وەك: خانوو، ئۆتۆمبێل، پێداویســتییە تاتبەتییەکان، هەروەها ئەو شــتانەی کە بــەردەوام بەکاردێــن، بێجگە لەمانە هەرجۆرێــك دەکڕیت، بیکڕە، بەڵام ژیانت پێویســتە زیاتری پێ بدەیت؛ بۆئەوەی جۆرێکی باشترت دەست بکەوێت.

* (دەتوانیت ئۆتۆمبێلێك بکڕیت مۆدێلەکەی ساڵێك، یان دوو ســاڵ بەســەریدا تێپەڕ بووبێت، لەڕووی مادیو جۆرەوە باشترە (وەرگێڕ).

**٤- بیر لە گرنگترین بکرەوە:**

پرەنســیپی بەڕێوەبردنی نــوێ، جەخت لــە گرنگترین کار دەکاتەوە، نەك ئەوەی کە گرنگە، شتە گرنگەکان زۆرن، کەسێکیش زیرەکــە، جەخت لە گرنگترین دەکاتەوە، گرنگترینو باشــترین هەڵدەبژێرێــت لە نێوان هەڵبژاردنەکاندا، ئەوەی کە گرنگترینە، کاریگەریــی هەیە لە درێژماوەدا، کاریگەریی زیاترە لەســەر تۆو دەوروبــەرت، ئەوە گرنگترینە کە ســوودی بۆ دیــنو دونیاکەت، ئەوە گرنگترینە کە هەردووکیانی تێدابێت. گرنگترین ئەوە نییە کە گرنگەو لە داهاتوودا دێت، مەرج نییە هەموو گرنگێك ئەنجام بدرێت، کەســی سەرکەوتوو، پێداگری لەسەر کارە گرنگترینەکان دەکاتــەوە کە دێن، ئەوانەی کە ماوەی پێگەیشــتنیان دوور نییە، لە داهاتووشدا کاریگەریی گەورە دادەنێن.



پــلان

# پلانی سەرژمێریی دانیشتوان

## ناوەڕۆکی پلانی سەرژمێری دانیشتووان

سامان کەریم

بەشی سێیەم

لەم بەشەدا، بەگشتی باسی چەندان خاڵی گرنگ دەکەین، کە لەم پلانەدا شــی دەکەینەوە، گرنگیی هەمووشــیان باس دەکەین بــۆ پلانەکە، هەروەها لــە داهاتووشــدا چ گرنگییەکیان دەبێت، هەموویان بەباشی باس دەکەینو ڕوونیان دەکەینەوە.

### زانیارییەکان

دیارە مەبەستمان پێی، زانیاریی هەر تاکێکە، کە بەم سیستمە نوێیە، کاری لەسەر دەکرێت، بۆ ئەم بەشەش دوو شێوازمان هەیە.

١. فۆڕمی خێزانی: ئەم بەشــە تایبەتە بە هەموو تاکێك، کە لەو خێزانەدان، تەنها ســەرۆکخێزان لە خشــتەی سەرەکیدایەو ئەندامانــی خێزان لکێنــراون بەمەوە (وەك گوتــم: ئەم پلانەم لەســەر ڕۆشــنایی Microsoft access دارشــتووە، بۆیــە شیکردنەوەکەشــم زۆرینەی تایبەت دەبێت بەو بەرنامەیە، بۆیە مەبەستمان لەم شێوازە، بریتییە لەوەی کە بۆ نموونە: خێزانێك لە ٥ کەس پێك دێت، سەرۆك خێزان لە خشتەکەدا دەنووسرێتو ئەندامــەکان دەلکێنرێن بــەوەوە، واتە: کاتێــك مامەڵەی لەگەڵ دەکەیــت، وەك ئەوە وایە، لەگەڵ خێزانەکەدا مامەڵە بکەیت، کە گرنگیــی ئــەم فۆڕمە لەوەدایە، هەموو خێزان لە یەك خشــتەدا کۆ دەکاتەوەو هەموو ئەندامەکان لەناو ئەو خشــتەیەدان)، واتە: هەندێــك زانیاری، وەك شــوێنی نیشــتەجێبوونو زۆر زانیاریی دی، تەنها ســەرۆکخێزان دەگرێتەوە کە گرنگیی لەوەدایە، کاتێك بتەوێــت بزانیت چەند خێزان لە پارێزگایەك، یان قەزایەك، یان گوندێك، یان گەڕەکێکدا هەن، ڕاســتەوخۆ بەم ڕێگایە دەیزانیت، ئــەوەی گرنگە، ژمــارەی هەموو ئەندامەکانیش لەم خشــتەیەدا تۆمار دەکرێت، کە ڕاستەخۆ ژمارەی دانیشتوانیش دەزانیت. واتە: هەم ژمارەی خێزان دەزانیت، هەم ژمارەی تاکەکان. شــێوازی ئەم فۆڕمە، شێوازی خشتەی هەیە.

٢. فۆڕمــی تاکەکەســی: ئــەم فۆڕمەیان، هەمــوو تاکەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە بە سەرۆکخێزانیشــەوە، کــە زانیاریی هەر تاکێکــەو مانــای هاوڵاتیبوون دەگەیەنێت، شــێوازی ئەم فۆڕمە شێوازێکی وێنەییی هەیە.

### ڕوونکردنەوەی فۆڕمەکان

#### یەکەم: فۆڕمی خێزانی

ئێســتا فۆڕمی خێزانی ڕوون دەکەینەوە، کە خشــتەکەی لە چەند بەشێك پێك دێت.

+ ژمارە کۆد

+: ئەم هێمایە کاتێك دروست دەبێت، کە خشتەی ئەندامانی خێزان دەبەســتین بە خشــتەی ســەرۆکخێزانەوە، هەرکاتێکیش کلیك لەم هێمایە دەکەین، شێوەکەی دەگۆڕێت بۆ (-)و ئەندامانی خێزان بەپێی ڕیزبەندی دەردەکەون.

ژمــارە: ئەم ژمارەیە مەبەســتمان پێی، ژمــارەی خێزانە لە هــەر ناوچەیــەك کە بەشــێوەیەکی ئۆتۆماتیك زیــاد دەکات، لە ژمارەیەکــی ئەو ناوچەیە، یان پارێزگا، یان قەزاو ناحیە، تا کۆتا ژمــارەی خێزان چەند بێت لەو ناوچەیــە، کە گرنگیی لەوەدایە ڕاستەخۆ ژمارەی خێزانی ئەو ناوچەیەمان پێ دەڵێت.

کۆد: یەکێکە لەگرنگترین بەشەکانی ئەم پلانە، کە ناسنامەی هەموو تاکو خێزان پەیوەست دەبێت بەم بەشەوە، بەڵام چەند تایبەتمەندییەکی گرنگــی هەیــە، کــە پێویســتە یــەك بەیــەك ڕوونیــان بکەینــەوە.

**یەکەم: تایبەتمەندیی پارێزگاکان.**

ئێمـــە وەك هاوڵاتیی هەرێمی کوردســـتان، مادام لەســـەر ئەم سنووره جوگرافییه دەژین، کەواتە: سەرژمێریش بۆ ئەم سنووره جوگرافییـــه دەکەین، بەپێی شـــوێنەکانی نیشـــتەجێبوون، واتە: لەهەر شـــوێنێکی ئەم هەرێمەدا، کەســـێك، یـــان خێزانێك بژیو بەرەســـمی خەڵکـــی ئەم هەرێمە بێت، وەك لەپێشـــەوە باســـمان کرد، ئەم مافی هاوڵاتیبوونە دەیگرێتەوە، وەك دەزانین ســـنووری هەرێمی کوردســـتان، لە ئێســـتادا پێك هاتووە لەم سێ پارێزگایە، بەڵام وەك وتم کە بڕیاری تەواوەتی لە کەرکوکیش درا، ئەو کات دەبێت بە چوار پارێزگاوە گەر بڕیاری بەپارێزگابوونی هەڵەبجەش بەتەواوی درا، ئەو کات دەبێت بە پێنج پارێزگا، بەڵام ســـنووری پارێزگاکـــە بەتەواوی دیاری بکرێت، واتـــە: چەند قەزاو ناحیەو گوند دەچنە ســـەر پارێزگای هەڵەبجە، دەبێت دیاری بکرێت، کە ئەمانە کاتی دەوێت، هەروەها گەر پارچەکانی تری کوردستانیش ســـەربەخۆیی خۆیان وەرگرتو کوردستانی گەورە درووست بوو، ئەوکات ئەم پلانە ئەوانیش دەگرێتەوە، کە دواتر دەزانین چۆن؟ بەڵام لەئێســـتادا تاکـــو کۆتایی پلانەکە، ئێمـــە بۆئەوەی هەموو جارێك ئەمە نەڵێینەوە، هەرێمی کوردستان مەبەستمان پێی سێ پارێزگاکە دەبێت، گەر هەرێمی کوردســـتان بوو بەچەند پارێزگا حســـابی ئەوەندەی بۆ دەکرێت، بەڵام بۆ بەرچاوڕوونی تەنها سێ پارێزگاکـــە حســـاب دەکەین؛ بۆئەوەی ئەوەنـــدە پچڕان نەکەینە بابەتەکـــەوە، واتە: هەر پارێزگایـــەك دەبێت بە خاوەنی کۆدێکی تایبەت بە خۆی

پرســـیار: بۆچی بەو شـــێوازە ژمارەکانمان دیاری کرد؟ واتە: سلێمانی (٠١) مان نووسیو هەولێر (٠٢) دهۆك (٠٣) .

وەڵام: لەبەرئـــەوەی گەر لە داهاتوودا، دەوڵەتی کوردســـتانی گەورەمـــان درووســـت کرد کە پێـــم وابێت لە ئێســـتادا نزیکەی (٣٨) پارێـــزگا دەبێـــت؟! ئـــەو کات ئەم پلانـــە دەتوانێت هەموو پارێزگاکانی تری کوردســـتانی گـــەورەش بگرێتەوە، واتە: بەپێی ئەم ژمارەبەندییە، ژمـــارەی پارێزگاکان تاکو ژمارە (٩٩) دەڕوات کـــە زۆر گرنگە، بەڵام گەر وا نەبێـــت، ئەوا ژمارەی پارێزگا تاکو ژمارە (٩) دەتوانین دابنێین، کە بۆ داهاتوو ژمارەی سەدی باشترە لە دەیی. گەر لەم ســـنووره جوگرافییەدا، ژمارەی پارێزگا زیادی کرد ئەوکات کێشـــەمان بۆ درووســـت نابێت. واتە: یەکەم هەنگاو ژمارەبەندیی پارێزگا دەکەین.

بـــەدەر لەمەش خاڵێکی دیکـــەی گرنگتر، بۆئـــەوەی ژمارەی دانیشتووانی هەر پارێزگایەك لەڕێگای ئەم ژمارەبەندییەوە بزانین، کە ئەمەش گرنگیی خۆی هەیە، بۆ زانینی ژمارەی دانیشـــتووان. واتە: کاتێك دەڵێین ســـلێمانی لەڕێـــگای کۆ دەکەیەوە دەزانین کە ژمارە (٠١) کۆدی هەموو ئەو هاوڵاتیانەیە کە دانیشتووی پارێزگای ســـلێمانین، بەهەمان شـــێوەش بۆ هەولێرو دهۆك، ئەمە تەنها بۆ پارێزگا، لە دواتردا باسی قەزاو ناحیەش دەکەین.

**دووەم: تایبەتمەندیی قەزاو ناوەندی پارێزگاکان.**

هەر پارێزگایەك لە ناوەندی پارێزگاو چەند قەزایەکی گەورە پێك دێت، کە هەر یەکێك لەو قەزا گەورانەش لە چەند ناحیەو گوندو گەڕەکێك پێك دێت، کە بەسەرجەمیان دەوترێت پارێزگا.

گەر لەوێنەکەوە سەیر بکەین پارێزگای سلێمانی لەناوەندەوە ژمارەبەندیمـــان کـــردووە بـــۆ کۆتا قەزا کـــە هەڵەبجەیە، بەپێی سیستمی بازنەیی چەق.

پرســـیار: بۆچی بەهەمان میکانیزمی پارێزگا، ژمارەبەندیی ناوەندو قەزاکانمان کرد؟

وەڵام: سێ وەڵامی هەیە؟

**یەکەم:** لەبەر ئەوەی گەر ســـەیری پارێزگای ســـلێمانی بکەین لەگەڵ ناوەندا خاوەنی یانزە قەزای گەورەیە، کە هێشتا کوردستانی گـــەورەش درووســـت نەبـــووە؟! واتە: نابێـــت بە ژمـــارەی دەیی ژمارەبەندیی بکەین، بەڵکو دەبێت بە ژمارەی سەدی ژمارەبەندیی بکەین؛ چونکە بەناوەندو قەزاکانەوە لە (١٠) زیاتر بوون.

**دووەم:** لەبەرئـــەوەی لەداهاتـــوودا بەهـــۆی زۆربوونـــی دانیشـــتووانەوە، لـــە چەنـــد ناحیەیەکـــی گـــەورەدا ڕەنگـــە ئەو ناحیانەش ببن بە قەزا بۆیە ئەم ڕێگایەمان بەکارهێنا؛ بۆئەوەی لەگەڵ زۆربوونی قەزاکاندا، کێشەی ژمارەمان بۆ درووست نەبێت.

**سێیەم:** بۆئەوەی ژمارەی دانیشتووانی هەر یەك لەو ناوەندو قەزایانە بەشـــێوازێکی زانســـتی بزانین بۆ ڕووبەڕبوونەوەی هەر گرفتێك کە تووشـــی دەبین لەدهاتوودا ڕاســـتەوخۆ لەڕێگای ئەم ژمارەبەندییەوە، دەیزانین بەنموونە: چارەســـەرکردنی کێشـــەی کرێچـــی وەردەگریـــن؟ ئایا دەتوانین کێشـــەی کرێچی چارەســـەر بکەین؟ بەڵێ، گەر بزانن لەئێســـتادا هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کرێچێتی بەڕێگایەکی زۆر نازانستی دەکرێت، وەك ئەوەی کە شـــوێنێك لەپارێزگا دیاری دەکرێتو یەکەی نیشـــتەجێبوونی لەســـەر درووســـت دەکرێت! ئەمـــە واز لەوە بهێنـــە کە یەکەکان بەکەڵـــك نایـــەنو مەرجـــی ئەندازیاریـــی تەواوی تێـــدا پەیڕەو ناکرێت؟! سەرباری ئەمەش، لە هەموو قەزاو ناحیەکانەوە، خەڵك دێـــت بـــۆ وەرگرتنی فۆڕم، کـــە ئەمەش هەر زۆر نازانســـتییەوە خۆتان بینیوتانە چ هۆســـەیەك درووســـت دەبێت، بۆ وەرگرتنی فۆڕم؟! ئینجا سەرباری ئەوەی کە تەنها فەقیر سوود لەم یەکانە وەرناگرێـــت، بـــەوەی جارێکـــی دی ئـــەم یەکانـــە بازرگانی پێوە دەکرێتەوەو کڕینو فرۆشـــی پێوەدەکرێـــت؟! کە باجەکەی تەنها هاوڵاتی فەقیر دەیـــدات؟ هەروەها ئەو یەکانەی کە وەردەگیرێن نازانرێت کە ئەوکەســـە شایســـتەی وەرگرتنی بووە، یان نا؟ واتە: ئایا بەڕاســـتی کرێچی بووە، یان نا؟ ئەمە تەنها یەك کێشـــە بوو، کە ئەم پلانە دەتوانێت چارەسەری بکات.

ئەی چارەســـەرکردنی بەم پلانە چۆن دەبێت، بەوەی ژمارەی خێزانـــی هەر یەك لـــە ناوەندو قەزاو ناحیەکان، بەشـــێوەیەکی زانستی دەزانین، دوای ئەوەی ژمارەی خێزانەکانمان زانی، ئەوکات بەپێـــی ئەم پلانە دەزانین چەند خێـــزان کرێچین، دوای ئەوەی کە زانیمان بەپێی ژمارەی ئەو خێزانانە یەکەی نیشـــتەجێبوون درووســـت دەکەین، کە لە ناوەنـــدو قەزا گەورەکاندا هەن. لەیەك کاتیشـــدا بۆ هەر ســـێ پارێزگاکە، ئەم ڕێگایـــە دەگرینە بەر؛ تا لەیەك کاتدا، هەموو یەکەکان تەواو ببێتو هەر خێزانێك بەپێی شایستەیی یەکەی پێ بدرێت.

ئەمە چ کاتێك دەکرێت، ئەو کاتەی بەشێوەیەکی تەندرووست، ئـــەم پلانـــە جێبەجێ بکرێت، ئـــەو کات ئەم ئامـــارە بەتەواوی دەزانین، لەهەر یەك لەناوەندو قەزاو ناحیەکاندا، چەند کرێچی هەیەو لەم ڕێگایەوە ئەم کێشەیە بنەبڕ دەکرێت. ئەمە تەنها بۆ بەرچاوڕوونی بوو، ئەگینا لەپلانی ئاوەدانکردنەوەدا، بەباشی ئەم لایەنەو چەندین لایەنی دیکەی گرنگ، ڕوون دەکەینەوە.

# هۆکاری دوورخستنەوەی کارمەندەکەت لە کارەکەی ڕوون بکەوە!!

کەمال حەمە سەرگەڵوویی

هیچ کاتێك پێشبینیم نەدەکرد، جارێکی دیکە گوێم لە دەنگی ئەو ئافرەتە بێت، کە یەکەم کەس بوو لە کار دوورم خستەوە، ئەوەتا ئێستا دوای شەش ساڵ لەو ڕووداوە، بە تەلەفوون پەیوەندیی پێوەکردمو پاش کەمێك لە هەواڵپرسیو چاكو چۆنی، ڕاستەوخۆ باسی لە هۆکاری پەیوەندیکردنەکەی کرد: دەمەوێت بزانم هۆی چی بوو، لە کارەکەم دوورت خستمەوە!!

ئەو پرسیارە ڕاستەوخۆ گەڕاندمیەوە بۆ ساڵی ٢٠٠٨، بۆ چەند مانگێکی قورسی سەرەتای ئەو ساڵە، کاتێك لە یەکێك لە ڕۆژنامەکاندا دەستم بە کاری ڕۆژنامەوانیی کرد، ئەوکات وەکو پیادەکردنی سیاسەتی کەمکردنەوەی خەرجییەکان، پێویست بوو دووەم هەواڵساز لە ڕۆژنامەکە دەربکەم، ئەویش پیاوێك بوو لە تەمەنی ٧٠ ساڵیدا، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو سەرمەشقو ڕێنیشاندەری من بوو لە کارەکەمدا!

هەروەها پێویستبوو پەیامنێرانو ڕۆژنامەنووسان بە خەرجییەکی کەمتر، بەرهەمێکی زۆرتر پێشکەش بکەن، ئەگەر یەکێکیان لە بەدیهێنانی ئەو ئەرکەدا شکستی هێنابا، ناچار بووم لە کارەکەی دووری بخەمەوە، من بڕیارو ڕێوشوێنە کارگێڕییە بڕیارلێدراوەکانم پێبەپێ جێبەجێ دەکردو هەرگیز خۆم بۆ پێشهاتە دەروونییەکانی وەك کەمخەویی و باوڕبەخۆنەبوون لە ئەنجامی بڕیارەکانمەوە، نەدەکردەوە.

### گەڕانەوە بۆ ڕابوردوو

ئەو ڕۆژە، ئەو ئافرەتەم لەگەڵ سەرۆکی بەشی سەرچاوە مرۆییەکانی ڕۆژنامەدا بینی، بڕیاری خۆم لەبارەی دوورخستنەوەی لە کارەکەی پێدا، ئەوکات داوای هیچ ڕوونکردنەوەو وردەکارییەکی لەبارەی هۆکاری بڕیارەکەوە لێنەکردم، وەك بڵێی پێشتر زانیبێتی لە کارەکەی دەردەکرێت، منیش بەهۆی بێدەنگییەوە، وام زانی هەموو شتێك بە ئاسایی تێدەپەڕێت!!

لەگەڵ ئەوەدا، ئەو پەیوەندییەی تەلەفوونییەی دوای ئەو ساڵانە ڕووی دا، بۆ منی ڕوون کردەوە، لەوانەیە ئەو کارەی کردوومە زۆر وردەکارییم تێیدا نەکردبێت، دەکرا من پێشتر ئەو ئافرەتەم باشتر بۆ بڕیارێکی لەو شێوەیە، ئامادە بکردایە، یان بۆم ڕوون بکردایەتەوە، کە چۆن بەو بڕیارە گەیشتووین، ئەو کات هیچ پێویست نەدەبوو، دوای ئەو چەند ساڵە، تەلەفوونی بۆ بکردمایە.

لە ڕاستیدا پێویستە فەرمانبەران، پێشتر لە هۆکارەکانی دەرکردن لە کارەکانیان ئاگادار بکرێنەوە، جا دەرکردن بێت، یاخود جیابوونەوەیەکی ئارەزوومەندانەی دەزگاو فەرمانبەرەکە بێت، پێویست ناکات هیچ کاتێك هەواڵێکی وا بەو کتوپڕییە، بە هیچ کەسێك بوترێت.

### ڕۆڵگێڕانی شایستە.

هەڵەکانی ڕابوردووی من، گرنگیی ئەوە بۆ بەڕێوەبەرەکان دەردەخەن، کە پێویستە چی بکەن، کاتێك کەسێك لە کارەکەیان



دەردەکەن، مەسەلەکە هاوپەیوەستە بە هەستی ئەو کەسەی لەسەر کارەکەی دەردەکرێت، یان هەندێکجار مەسەلەکە هاوپەیوەستە بەو پێودانگانەی لە دامەزراوەکەتدا ڕەچاو دەکرێت، کە پێویست دەکات گرنگی بە هەموو فەرمانبەرەکانت بدەیت، تا ئەو چرکەساتەی دامەزراوەکەت بەجێ دەهێڵێت.

ئەمەش بەپێی تێگەیشتنی قوستەنتین کۆرۆتۆف مامۆستای یاریدەر لە ڕەفتاری ڕێکخراوەیی (السلوك التنظيمی)و بەڕێوەبەری ناوەندی توێژینەوەی گەشەپێدانی سەرکردایەتی لە کۆلێژی کارگێڕیی کار لە بەرلینو ئەڵمانیا، بە دوو هەنگاو دەست پێدەکات.

**یەکەمیان:** تۆ هەرچیت بۆ هێشتنەوەی ئەو فەرمانبەرو کرێکارە لەدەست هاتووە، کردووتە.

کۆرۆتۆف دەڵێت: پێویستە لەسەر بەڕێوەبەر پێش دەرکردنی هەر فەرمانبەرێك، بتوانێت ئەم قسەیە بەخۆی بڵێت: من بەڕێوەبەرێکی باش بووم بۆ ئەم فەرمانبەرە.. دڵنیاش بێت لەوەی ئەو لەم ڕەفتارەیەوە شتێکی نوێ فێر دەبێت؛ بۆئەوەی هەمان هەڵە لەگەڵ فەرمانبەرانی دیکەی ژێر دەستی دووبارە نەکاتەوە.

**دووەمیان:** پێویستە بەڕێوەبەرەکان پێشهاتەکانی دەرکردنی فەرمانبەر لەسەر کارەکەی باش هەست پێبکەن، بێگومان سەبارەت بەو فەرمانبەرانەی لە تیمێکی جیهانییدا کار دەکەن پێشهاتو مەترسییەکانی بەپێی جیاوازیی کەلتووری کۆمەڵگاکانی دەگۆڕێت.

هەروەها ئەم مەسەلەیە، لایەنی یاساییشی هەیە، لە یاسای هەندێك وڵاتدا پێویستە بەڵگەی پێویست، پێشکەش بە هەر فەرمانبەرێك بکەیت، پێش ئەوەی لە کارەکەی دەری بکەیت.

لەوەش گرنگتر ئەو شوێنەوارە هەستیارەیە، کە پرۆسەی دەرکردن لەسەر کەسێتیی فەرمانبەر درووستی دەکات، لای هەندێك لە فەرمانبەران، ئەم هەنگاوە کاریگەرییەکی قورسی دەبێتو دوور نییە حاڵەتی مردنو خۆکوشتن لەنێو ئەو خێزانانەدا درووست بکات.

وەکو کۆرۆتۆف دەڵێت: دەرکردن لەسەر کار ڕووکارێکی کۆمەڵایەتیشی هەیەو هەندێکجار بە عەیبە سەیر دەکرێت، کە کەسێك بێکارە، لە هەندێك ناوچەشدا، بەتایبەت لە بەشێك لە وڵاتانی ئاسیا مەسەلەکە بە شتێکی عەیبە دادەنرێت.

ڕاندل بێترسن مامۆستای ڕەفتاری ڕێکخراوەیی لە کۆلێژی کارگێڕیی کار لە لەندەن، ڕای وایە ئەو ڕەفتارە کار لەسەر جووڵەی کارکردن لە نووسینگەشدا دادەنێت، بەجۆرێك لەوانەیە فەرمانبەرەکانی دیکە بپرسن: دەرکردنی ئەم فەرمانبەرانە بۆ ئەوان چی دەگەیەنێت؟ لەوانەیە لە مەعنەویاتی ئەوان بدات، بەتایبەت ئەگەر کەسێکی چالاكو کارا، لەکار دەربکرێت کە باسوخواسی هەموان بووە.

بەپێچەوانەشەوە لەوانەیە جووڵەی نووسینگە باشتر بکات، بەجۆرێك ئەگەر ئەو کەسەی دەرکرابوو، بارێکی قورس بوو بوو بەسەر هەموانەوە.

بەهۆی یاساکانی دامەزراندنو سیاسەتی کۆمپانیاکانەوە بەڕێوەبەرەکان ناتوانن هۆکاری دەرکردنی کەسێك بۆ هاوڕێکانی ڕوون بکەنەوە، بەڵام وەکو "بێترسن" دەڵێت: پێویستە دڵنیا بیت ئەو بڕیارەی داوتە، لە ڕووی ئیدارییەوە ئینسافو ویژدانی تێدابووە، واتە: لە کۆبوونەوەکاندا، جۆرێك لە دڵپێسووتان بۆ ئەو کەسانە دەرببڕێت، یان بە گرنگییەوە گوێ بۆ قسەی ئەو کەسانە بگیرێت، کە لەسەر کارەکانیان دەرکراونو ڕوونکردنەوەی تێروپڕیان لەسەر بڕیارەکە بۆ بدرێت.

### باجی ویژدانیی

جۆلیان دالزیل بەوردی باس لە کاریگەریی ویژدانی دەرکردنی فەرمانبەرێك لەسەر کار دەکات، بەتایبەت ئەوکاتەی دالزیل جێگری سەرۆکی کۆمپانیای (شل)ی بواری نەوتو سەرپەرشتیاری ئیدارەی توانا مرۆییەکانی ئەو کۆمپانیایە بوو لە ئەمریکاو پشکی شێری لە دەرکردنی فەرمانبەران بەردەکەوت.

بەپێی قسەی دالزیل، هەرگیز دەرکردنی فەرمانبەران کارێکی ئاسان نییە، بەڵام نارەحەتترین کات ئەو کاتەیە، تۆ بڕیارێکی وا بە هاوڕێیەکی دێرینی خۆت دەڵێیت کە نزیکەی ٣٠ ساڵە، پێکەوە هاوڕێن «لەکارەکەت دەردەکرێیت»!

ئەوکاتەی لە ساڵی ١٩٩٩ بڕیارم بۆ دەرکردنی هەزار فەرمانبەر لە کارکردن دەرکرد، بەڕاستی چرکەساتێکی زۆر ناخۆش بوو.

دالزیل پێی وایە دەرکردنی کەسێك لەسەر کارەکەی، بەهۆی بێتواناییو چۆنێتیی کارکردنییەوە، کارێکی زەحمەتترە وەك لە دەرکردنی بە حاڵەتێکی ئاسایی، بەڵام هەردووك حاڵەتەکەش کاریگەریی دەروونیی خۆیان، لەسەر بەڕێوەبەر هەیە.

ئەو ئەزموونی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەو کاتەی بۆ یەکەمین جار فەرمانبەرێکم لەسەر کارەکەی لابرد، هەستم بە حاڵەتێکی دەروونیی خراپ لە کەمخەوییو داڕووخانی باری تەندرووستیی کرد، کاتیکیش دوای چەند ساڵێك، ئەو فەرمانبەرە، تەلەفوونی بۆ کردمەوە، تووشی هەمان حاڵەتی دەروونیی بوومەوە.

دوای چەند مانگێك لە پەیوەندییە تەلەفوونییەکەی، لە خۆم دەپرسی چۆن دەمتوانی کێشەکە بەشێوەیەکی دیکە چارەسەر بکەم، بۆیە ئەمجارە من پەیوەندییم پێوەکردەوەو پێم وت: ئەگەر دەتەوێت جارێکی دیکە قسە بکەین پێکەوە، تا دوای ئەو ساڵانە هۆکاری دەرکردنەکەی، لەسەر کارەکەی بۆ ڕوون بکەمەوە!

ئەو وتی: تەنها ویستم بزانم هۆکاری دیکە بۆ دەرکردن لە کارەکەم هەبووە؟!

ئەو فەرمانبەر پێی وابوو من وەك بەڕێوەبەری نەمتوانیوە باش لە دۆخەکە تێبگەم، یان لەبارەی بڕیاری دەرکردنەکەیەوە، پێشەکییەکم پێبدایە.. ئەو ئێستا وەك پەیامنێری کەناڵێکی ڕاگەیاندنی ئەمریکی کار دەکات، بەڵام ئەو دەرکردنەی لە شوێنی کاری پێشووی بەجۆرێك کاری تێکردووە، کە تەنانەت بیری لەوە کردووەتەوە بۆ هەمیشە واز لە کاری ڕۆژنامەنووسیی بهێنێت، دەڵێ: ئەو ڕەفتارە بریندارکەر بوو!!

لەگەڵ ئەوپەڕی داوای لێبوردن، لەساڵی ٢٠٠٨ەوە پێویست بوو لەسەرم کەسانی دیکە لە کارەکانیان دوور بخەمەوە، بەڵام هیوادارم ئەو فەرمانبەرانە پێم بڵێنەوە، کە من بەویژدانەوە کاری خۆم جێبەجێ کردووە؟

هاوشێوەی سەرجەم بەڕێوەبەرەکان، دەخوازم ئەو توانایە بەدەستهاتوو بێت، نەك خۆڕسك بێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەکارهێنانی زۆر کەم بێت.

ئەم بابەتە لە ماڵپەڕی بی بی سی عەرەبییەوە وەرگێراوە.



# کارگێڕیی کۆگا (إدارة المخازن)

وەهاب حەسیب

## دەستپێك:

بەشێوەیەکی بنەڕەتی، بەرهەمهێنانی شمەك پشت بە دابینکردنی کەرەستەو ئامادەکاریی پێویست دەبەستێت، کەرەستە شادەماری ژیانی پیشەسازییە؛ چونکی بێ کەرەستە، مەحاڵە پرۆژە بوونێکی هەبێت، بۆیە پێویستە کەرەستە بەبڕو کوالێتی، لە شوێنی گونجاوو بەنرخی گونجاوو لە کاتی پێویستدا هەبێت، بێشك نەبوونی هەریەکێك لەوانەی باسکران، هۆکاری بەرزبوونەوەی نرخو زۆریی تێچوونن.

هۆکار زۆرن، کە وایان کردووە چاو لەسەر کاری کڕین چڕ بکرێتەوەو گرنگی پێ بدرێتو ببێت بە یەکێك لە کارە سەرەکییەکانی پرۆژە، لەوانە:

کەمیی کەرەستە کە ئەنجامی زۆریی خواستە، بەتایبەت ئەگەر ئەو کەرەستەکانە، لە بازاڕی دەرەکیدا پەیدا بکرێن، سەرباری زۆریی ڕکابەری، ناتوانرێت گشت ساتێك پێشبینی پەیداکردنی کەرەستەکان بکرێت. بێگومان تێچوونی کەرەستەکان یەکێکە لە هۆکارەکان کە کاریگەری لەسەر قازانجی پرۆژەکە هەیە، بۆیە پرۆژە پیشەسازییەکان لێکۆڵینەوە لە کەمی تێچوونی کەرەستە دەکەن، ئەوکارەش دەخەنە ئەستۆی بەڕێوەبردنی کڕین.

لە ڕۆژگاری ئەوڕۆدا، بەڕێوەبردنی کڕین تەنها بریتی نییە لە: کڕینی کەرەستەو پێداویستییەکان، ئیشی کڕین لە ئەمڕۆدا پێك دێت لە نەخشەکێشان بۆ کڕین، ئەو هەنگاوانەی کە پێداویستی کڕین تەواو دەکەن. دیاریکردنی سەرچاوەیەکی گونجاو ... هتد. گشت ئەو هەنگاوانەی باسکران چوستو چالاکی بەڕێوەبردنی کڕین دیاری دەکات.

## بەکارهێنانی پاشماوەکانی بەرهەمهێنان:

کاتێك باس لە پاشماوەکان دەکرێت، لەوانەیە بیری خوێنەر بۆ کۆمەڵێکی زۆر لە پاشماوەو خاشاك بچێت، بەڵام لە بواری بەرهەمهێناندا، ئیشەکە تەواو جیاوازە؛ چونکی هەندێ پاشماوەی پیشەسازی، بەهایەکی زۆریان هەیە، تەنانەت هەندێ بواری پیشەسازی وەك کەرەستەی سەرەتایی، مامەڵە لە تەك پاشماوەکانیدا دەکات.

تا ماوەیەك بەر لە ئێستا، پاشماوەکانی پیشەسازی گرفتێکی گەورەبوو، گەرچی تا نهاش ئەو گرفتو مەترسییانە ماون؛ چونکی ناکرێت پیشەسازی هەبێتو پاشماوەی نەبێت، پاشماوەکانی پیشەسازی بریتین لە ئامێرو ئامرازی بەکارهاتوو، یاخود بەسەرچوو کە لە کۆگاکاندا هەڵگیراون، یان ئەو پارچەو سەرەپارچانەن، کە دەرئەنجامی هەڵەکردن پەیدابوون، بەڕێوەبەرێتیی سەرکەوتوو، ئەو بەڕێوەبەرێتییەیە، کە بتوانێت بە باشترین شێواز خۆی لەو پاشماوانە ڕزگار بکات.

## جۆرەکانی پاشماوەی بەرهەمهێنان:

١. ئەو یەکانەی کە لە یەکەکانی بەرهەمهێنان جیا کراونەتەوەو پەراوێز خراون؛ چونکی ئەو یەکانە ئەو خەسڵەتانەیان تێدا

نییە، کە لە بوارێکی دیاریکراوی بەرهەمهێناندا پێویستن، وەك جۆرو باشێتیی بەرهەمەکە.

لێرەدا تەنها ئەو بەرهەمانە ناگرێتەوە، کە درووستکردنیان تەواوبووە، بەڵکو ئەو بەرهەمانەش دەگرێتەوە، کە لەژێر کاری خۆشەو تەواوکردندان، بەڵام درووستکردنیان بە هۆکارێك، وەك کەمتەرخەمی، هەڵە، کێشەو ناتەواوی لە ئامێرو ئامرازەکاندا نەگەیشتۆتە قۆناغی کۆتایی.

٢. پاشماوە زیادەکان: دامەزراوە پیشەسازییەکان پێداویستییەکانیان لە ئامێرو ئامرازەکانی ئیشکردن لە بەرمیل، سندووقی دارو کیسەی جۆراوجۆردا بەدەست دەخەن، ئەم پاشماوانە بەهای خۆیان هەیە، بۆیە دامەزراوەکە بەکاریان دەهێنێتەوە یاخود دەیانفرۆشێتەوە.

٣. وردە: ئەو ئامێراو ئامرازانەن کە لەکار کەوتوونو چاك ناکرێنەوە، جارێکی دیکەش ناتوانرێت بەکار بهێنرێنەوە.

پێشکەوتنی هونەری لە شێوازەکانی بەرهەمهێناندا، کارێك دەکات بەڕێوەبەرێتیی ڕێکخراوەکە، زیاد گرنگی بدات بە دابینکردنی پێداویستییەکانی پرۆژە لە سەرچاوەکانی کارکردن، ئەوەی باسکرا بەشی یەکەمی بە هونەری کڕین ناودەبرێت، بەشی دووەمی بریتییە لە: هونەری هەڵگرتن، کە خۆی لە هەڵگرتنو پارێزگاریکردن لە پێداویستییەکانی بەرهەمهێناندا دەبینێتەوە بۆ کاتی پێویست. پێویستە بیرمان نەچێت، هەڵگرتن بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆرە، جۆری یەکەم پەیوەستە بە هەڵگرتنی ئەو سەرچاوانەی کڕدراون. واتە: هەڵگرتنی سەرچاوەکان بەر لە بەرهەمهێنان، بەشی دووەم ئەو بەرهەمانەیە، کە بەرهەمهێنانیان تەواو نەبووە، یاخود بەتەواوی بەرهەم هێنراونو چاوەڕێی فرۆشتنن.

**گرنگیی کاری هەڵگرتن:**

کاری هەڵگرتن بە ئیشێکی گرنگ بۆ زۆرێك لە دامەزراوەکان دێتە ئەژمار، لە دامەزراوە پیشەسازییەکاندا، زیاتر گرنگییەکەی دەردەکەوێت؛ چونکی سوودی لە کەڵکی گشتییدا دەردەکەوێت، کاری هەڵگرتن ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر کاری بەرهەمهێنان هەیە؛ چونکی پێداویستییەکانی بەرهەمهێنان؛ لە سەرچاوە، ئامراز، پارچەی یەدەكو خزمەتگوزاری دابین دەکات.

گرنگینەدان بە کاری هەڵگرتن، لەسەر تێچوونی بەرهەمەکان زۆر دەرکەوێتو زەرەری لێ دەدات، زۆرێك لە دامەزراوەکان، توانیویانە پێگەی ڕکابەرییان بەهێز بکەن، تێچوونی بەرهەمەکانیان کەم بکەنەوەو پلانی گونجاو بۆ ئیشەکانیان دیاری بکەن، پاش ئەوەی کاری هەڵگرتیان بە شێوەیەکی لۆژیکانەو سەرکەوتووانە ئەنجام داوە.

**ئامانجەکانی هەڵگرتن:**

١. پاشکەوتکردنی پێداویستییەکانی ڕێکخراوەکە، لە ئامێرو ئامرازی پێویست بۆ کاری بەرهەمهێنانو ئەو پارچانەی نیوەی ئیشەکانیان تەواوکراوە، تا ئەو ئامێرو ئامرازو کەرەستەو تفاقانە بەشێوەیەکی درووست لە بەردەستدا بنو لە کاتی پێویستداو بۆ بەردەوامی کاری بەرهەمهێنان سوودیان لێوەربگیرێت.

٢. هەڵگرتنی ئەو بەرهەمانەی کاری بەرهەمهێنانیان تەواوبووە، تا بەشێوەیەکی گونجاو هەڵبگیرێنو لە کاتی پێدویستدا بە بڕی پێویست بەکاربهێنرێن.

٣. هەبوونی زانیاری پێویست، بە مەبەستی گونجاندن لە بەرنامەکانی کڕین، فرۆشتنو بازاڕسازیدا.

بۆ هەژمارکردنی بڕی تێچوونو پێداویستییەکانی قۆناغەکانی بەرهەمهێنان، کارکردن بۆ کەمکردنەوەی تێچوونو کەمکردنەوەی قەبارەی سەرمایە لە بواری وەبەرهێنانو هەڵگرتندا بۆ کەمترین ئاست.

٤. دڵنیابوون لە لەناوچوون، خراپوونو دزی جۆرە جیاوازەکانی بەرهەم، ئەمکارەش لە میانەی سیستەمێکی وردی وەرگرتن (استلام)و هەڵگرتن (تخزین)دا دەبێت. هاوکات سەرفکردنی ئەو بەرهەمانەی هەڵگیراون.

**جۆرەکانی کۆگا:**

بەشێوەیەکی گشتی کۆگا دابەش دەبێت بۆ دوو جۆری سەرەکی، ئەوانیش بریتین لە: کۆگای بەردەوامو کۆگای کاتی، کۆگای کاتی ئەو کۆگایانەن کە لە بەشێکی ڕێکخراوەکەدا هەن، زۆربەی کەرەستەکانی لە کۆگا سەرەکییەکانەوە بۆ دابین دەکرێتو بەشێوەیەکی کاتی، لەو کۆگایانەدا هەڵدەگیرێن.

بە دیوێکی تردا، کۆگا دابەش دەبێت بۆ:

أ. کۆگای سەربەتاڵ.

ب. کۆگای داخراو: کۆگای داخراویش ئەو کۆگایەیە لەسەر زەوی درووست کراوە، یاخود لەژێر زەویدا بنیاتنراوە.

کۆگای داخراو، ئەوانەی لەسەر زەوی بنیات دەنرێت، بەشێوەیەکی گشتی لە نهۆمێك یان چەند نهۆمێك پێکدێت، دابەشدەبێت بۆ هۆڵو چەند بەشێك کە هەڵگرتنو دەرکردنی بەرهەم تێیدا بە نووسراوو بە ڕەسید دەبێت.

بەڵام ئەو کۆگایانەی لەژێر زەوی بنیات دەنرێن، زیاتر ئەو کەرەستانەیان تێدا هەڵدەگیرێت کە توانای گڕگرتنیان زۆرە، وەك نەوتو غاز، یاخود ئەو کەرەستانەی کە پەیوەستن بە هەڵگرتنی تفاقی سەربازی.

لەگەڵ پێشکەوتنی زیانو تەکنەلۆژیادا بیرکردنەوە لە کۆگاو چۆنێتیی بنیاتنانو مامەڵەکردن لەتەکیدا، گۆڕانکاری بەسەر هاتووە، بیرمان نەچێت کۆگا لە درووستکردن، بەڕێوەبردن، چاودێری...هتد، تێچوونی هەیە، ئەو تێچووناش بەشێکن لە خەرجییەکانی دامەزراوەکە. بە مەبەستی کەمکردنەوەی خەرجیو بەهێزکردنی پێگەی ڕکابەری ڕێکخراوەکە لە بازاڕی ڕکابەریدا، زۆرێك لە کۆمپانیا زەبەلاحەکان کۆگایان هیچە (صفر) ە.

بۆ نموونە: کۆمپانیایەکی وەك (تۆیۆتا) ساڵانە ژمارەی ئەو ئوتومبێلانەی درووستی دەکات، زیاترە لە ڕووبەری وڵاتەکەی (یابان)؛ چونکی کۆمپانیای تۆیۆتا، توانای ئابووریو تەکنەلۆژیای بەرزە، بۆیە هەرکات گرێبەستێك لەگەڵ وڵاتێك، یان دامەزراوەیەکدا گرێ بدات؛ ئەوا بەپێی گرێبەستەکەو بەدڵخوازی کڕیارەکەی، ئوتومبێلەکانی بۆ درووست دەکات. بەم شێوەیە لەو خەرجیو بەپرسیارێتییەی لە ئەنجامی هەبوونی کۆگاوە درووست دەبن، خۆی قوتار دەکات.



# وەفاداریی پاشای دارستان

لە دێر زەماندا، گیانداران پێکەوە لە دارستانێکدا دەژیان، تەبایی‌و هاوڕێیەتی لە نێوانیاندا لە لوتکەدا بوو، جگە لە ڕێوی، کەس لەوان فێڵ‌و تەڵەکەی نەدەزانی، ئەوان یەکدییان خۆش دەویست، پێکەوە بەئاسوودەیی هاوشێوەی خێزانێك دەژیـان..

لەم چیرۆکەدا، باس لە بەرخێکی بچکۆلانە دەکەین، کە لەگەڵ بەرخێکی دیکەدا، زۆر هاوڕێیەتییان خۆش بوو، ئەگەر ڕۆژێك یەکدییان نەدیبا، زۆر بۆ یەکدی بێتاقەت دەبوون، ڕۆژێکیان هاوڕێی بەرخە بچکۆلانەکە، زۆر نەخۆش بوو، بەرخە بچکۆلەکە بۆ چوونە لای هاوڕێکەی، داوای مۆڵەتی لەدایکی کرد، دایکی وتی: ئێستا ئێوارەیەو خۆر خەریکە تیشکە زێڕینەکەی ئاوا دەبێت، تاریکایی شەو باڵ بەسەر ئاسماندا دەکێشێت.. چاوەڕێ بکە، تا سبەی خۆر، بە تیشکە زێڕینەکەی، ئاسمان ڕووناك دەکاتەوە، ئەو کات پێکەوە دەڕۆین بۆ لای هاوڕێکەتو سەردانی دەکەین‌و لە تەندرووستیی دڵنیا دەبین. بەڵام بەرخە بچکۆلە گوێی بۆ ئامۆژگارییەکەی دایکی نەگرت، بێ پرسی دایکی ڕۆیشتە دەرەوە بەرەو ماڵی هاوڕێکەی بەڕێ کەوت، ملی ڕێگەی گرت بەرەو ماڵی هاوڕێکەی، کاتێك خۆی بینییەوە، لەنێوەڕاستی دارستان لەنێو کۆمەڵێك درەختی زەبەلاحو چروپڕ، هیچ ماڵێکی بەدی نەکرد، دنیا خەریك بوو تاریك دەبوو، بەرخە بچوکەکە زۆر ترسا، هەر دەگەڕا لێرەو لەوێ، بەڵام هیچی بەدی نەکرد، دەستی کرد بە گریان، لەو کاتەدا مام ڕێوی چاوی کەوت بە بەرخە بچکۆلانە.. وتی: بچکۆلە ئەوە چییە؟ بۆچی دەگریت؟

بەرخە بچکۆلە وتی: لەنێو ئەم دارستانەدا، ڕێگەم ون کردووەو نە دەزانم بگەڕێمەوە ماڵی خۆمان، نە دەتوانم ماڵی هاوڕێکەم بدۆزمەوە، تکایە هاوکاریم بکە..

مام ڕێوی وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی، بیری لە فێڵێك کـردەوە، بڕیاری دا بەرخە بچکۆلە بکات بە دیـاری دەستی بۆ شێری پاشای دارستان، وتی: بچکۆلانە وەرە لەگەڵ من، تا بتگەیەنمەوە نێو ماڵی خۆتان. بێگومان ئێستا دایکت چاوەڕێتەو دڵی لە لاتەو خەمبارە بە نەگەڕانەوەت!

مام ڕێوی بەرخە بچکۆلەی گەیاندە ناو ماڵی شێرو وتی: جەنابی پاشا، هیوادارم ئەم دیارییە بچکۆلانەیەم لێ قەبووڵ بکەیت!

بەڵام ئەوەی ڕێوی سەرسام کرد، ئەوەبوو کە دیتی بەرخە بچکۆلانە زۆر خۆشحاڵ بوو، پێی گوت: ئەوە ناترسی؟

بەرخە بچکۆلە لەبری ئەوەی وەڵامی مام ڕێوی بداتەوە، ڕووی لە شای دارستان کردو وتی: من دەناسیتەوە، بەرخە بچکۆلانەم، باوکم حەکیمی دارستان بوو، باوکم بوو هاوکاری کردیت، ئەو کاتەی ڕاوچییەکان ویستیان تۆ ڕاو بکەن، برینەکەی تیمار کردیت، تا ئەو کاتەی چاك بوویتەوە، ئایا ئەو ڕووداوەت لەیادە؟

شێری پاشاو بەوەفا: بەڵێ بیرمە، باوکت پیاوێکی بەخشندەو حەکیم بوو، پزیشکێکی لێهاتوو بوو، هەرگیز ئەو هاوکارییەی باوکت لەیاد ناکەم!

بەرخە بچکۆلانە وتی: پاشا، چۆن یارمەتیم دەدەیت، من ڕێگەم ون کردووەو دەمەوێت یارمەتیم بدەیت؟

شێری پاشا وتی: بێگومان من دەتگەیەنمەوە ماڵی خۆتان‌و بە خانەوادەکەت شادت دەکەمەوە!

مام ڕێوی گوتی: بەڵام جەنابی پاشا.. پاشا ڕێگەی نەدا قسەکەی تەواو بکات، وتی: من ناتوانم وەڵامی چاکە بە فێڵ‌و تەڵەکەو ناپاکی بدەمەوە.

شێری پاشا لە بێشەکەی هاتە دەرەوەو لەگەڵ بەرخە بچکۆلەکەدا، بەڕێ کەوت بەرەو ماڵی بەرخە بچکۆلانە!

کاتێك گەیشتنەوە ماڵەوە، دایکی پێی وت: ڕۆڵەکەم، بۆچی گوێت بۆ ئامۆژگارییەکەم نەگرت؟

بەرخە بچکۆلەکە وتی: بمبوورە دایەگیان، جارێکی دیکە، هەڵەی وا دووبارە ناکەمەوەو لە ئامۆژگارییەکانی تۆ دەرناچم!

دایکی وتی: ئەگەر چاکەو پیاوەتی باوکت نەبووایە، ئێستا تۆ لەنێو گەدەی شێری پاشادا بوویت!

خنجیلەکان، لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە فەرامۆشکردنی ئامۆژگاریی دایەو بابە، دوچاری ڕووداوی ترسناكو ناخۆشمان دەکـات، هـیوادارم هەرگیز ئامۆژگارییەکانی دایـكو باوکتان فەرامۆش نەکەن، هەمیشەفەرمانەکانیان جێبەجێ بکەن!

# جگەرەو نێرگەلە کێشان ٢\٢

ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

٥. جگەرە، یان نێرگەلە، کامیان مەترسیدارترن؟

بەشێوەیەکی گشتی، زیانەکانی نێرگەلە، زۆر لە زیانەکانی جگەرە زیاترە، بەجۆرێك کێشانی یەك نێرگەلە، کاریگەریی (٣٠) جگەرەی هەیە.

نێرگەلە لەم ڕێیانەوە، زیانەکانی درووست دەکات:

أ. زیانەکان بەهۆی توتنەوە: هەموو ئەو زیانانە درووست دەکات، کە لەبارەی جگەرە باسمان کرد لە ژمارەی پێشوو، بەڵام بەرێژەیەکی زۆر زیاتر.

ب. ماوەی کێشانی نێرگەلە: ماوەی نێرگەلەکێشان زۆرەو هەندێك جار دەگاتە نزیکەی کاتژمێرێك، بەمەش ماوەی بەرکەوتن بەژەهرەکان زیاتردەبێت. لە (٤٠) خولەك نێرگەلەکێشاندا، بڕی ( ١٠٠-٢٠٠) مژ لێدەدرێت، هەر مژێکیش بریتییە لە: نیو لیتر دووکەڵ بۆناو سییەکان، هەر لەبەر ئەمەشە، بڕی قەتران کەماددەیەکی ژەهرە، لەیەك ژەمی نێرگەلەدا (٣٦) هێندەی بڕەکەیەتی لە یەك جگەرەدا.

پ. بەکارهێنانی خەڵووز: بۆ گەشاندنەوەی نێرگەلە بەکار دەهێنرێت، لەکاتی کەمیی ئۆکسجیندا، گازی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدات، کە ژەهرە، کوشندەیە، بێبۆنو بێڕەنگەو دەبێت بەهۆی کەمکردنەوەی ئۆکسجین لە شانەکانی لەشدا. ئەمەش وا دەکات کەسەکە خوێنی خەست ببێتو ئەگەری تووشبوون بەنەخۆشییەکانی بۆریی خوێنو دڵو جەڵتەی دەماخ زیاتر بێت.

ت. ئاوی ناو شووشەی نێرگەلە: ئاو وەك سەرچاوەیەك بۆ ساردکردنەوەی دووکەڵ لەنێرگەلەدا بەکار دەهێنرێت، بەهۆی تێپەڕبوونی بڕێکی زۆری دووکەڵ بەناویدا، ژەهراویی دەکاتو کاریگەریی خراپ درووست دەکات.

ج. نەخۆشییە گواستراوەکان: زۆرجار چەند کەسێك لەکاتی کێشانی نێرگەلەدا، هاوبەش دەبنو یەك ئامێر بەکار دەهێنن، بەبێ گۆڕینی دەمەوانەی سۆندەکە، ئەمەش دەبێت بەهۆی گواستنەوەی هەندێك لە نەخۆشییە گواستراوەکانی وەك (تامێسك، سیل، هەڵامەت، ..هتد)، گەر لە یەکێکیاندا هەبێتو هەلگربێت.

٦. وازهێنان لە جگەرەو نێرگەلەکێشان: هیچ کاتێك درەنگ نییە بۆ وازهێنان لە جگەرەو نێرگەلەکێشان، بەڵام بێگومان تاکو زووتر دەستبەرداری بیت، ئەوا سوودمەندتر دەبیتو دوورتر دەبیت لە مەترسییەکانی، ساڵانە هەزاران کەس واز لەم خووە نادرووستە دەهێنن، هەوڵ بدە جەنابیشت یەکێك بیت لەو کەسانە، بەڵام ئەم کارە پێویستیی بە ئامادەسازییو پلانو توانای بڕیاردان هەیە. جگەرەو نێرگەلە، ماددەی نیکۆتینی تێدایە، کە کەسەکە ئالوودە دەکات، لەبەرئەوە دەگونجێت لەسەرەتادا لەڕووی لاشەییو دەروونییەوە هەندێك گرفتت بۆ درووست بکات، کەوابوو پێویستە خۆڕاگربیتو ڕەنگە چەند جارێك تێکۆشانت پێویست بێت.

بۆ وازهێنان ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکە:

أ. شارەزابوونو تێڕامان لە زیانەکانی:

زیان بەتەندرووستیی خۆتو خێزانو دەوروبەرت دەگەیەنێت.

لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، خەڵکی لێت دوور دەکەونەوەو حەز بە هاوەڵێکردنت ناکەن. پارەبەفیڕۆدانێکی زۆری لەگەڵدایە، زوو زوو پێویستت بە نەخۆشخانە دەبێت، بڕێکی باش لە سەروەتەکەت دەچێتە گیرفانی پزیشکانەوە!

پێستت چرچ دەکات، بۆنت ناخۆش دەکاتو دانەکانت زەرد دەکات.

دەبیت بەهۆکاری فێرکردنی منداڵەکانت!

ب. ڕۆژێك دیاریبکە بۆ دەستپێکردن:

بەرەوارێکی گونجاو هەڵبژێرەو لەناو خێزانو دەوروبەرتدا ڕای بگەیەنە، وەکو:

ڕۆژی لەدایکبوونت.

سەرەتای مانگی ڕەمەزان.

سەری ساڵی تازە.

پ. پێش بەرواری وازهێنان:

جگەرەکە بگۆڕە بۆ جۆرێك کە حەزت لێی نییە. وردەوردە ژمارەکەی کەم بکەرەوە، تاکو بەتەواوی دەیوەستێنیت.

بەدیار تەلەفزیۆنو ئینتەرنێتەوە مەیکێشە.

ت. دوورکەوتنەوە لەو شتانەی لە جگەرە نزیکت دەکەنەوە:

کەسانی جگەرەکێش، شوێنی چۆڵ، هەلگرتنی پاکەتو چەرخ.

ج. دۆزینەوەی جێگرەوە:

بنێشتو نوقڵی نەعنا، شەربەتو ساردەمەنیی، میوەو سەوزە.

چ. نیشانەکانی لێبڕان:

پاش وازهێنان، چەند نیشانەیەکی لاشەییو دەروونیت لێدەردەکەوێت، لەئەنجامی ئالوودەبوونەوە، پێویستە بەشێوەیەکی تەندرووست ڕووبەڕوویان ببیتەوە، وەك:

خەو زڕان: وەرزشکردنو دوورکەوتنەوە لە چاو قاوە، پێش نووستن.

برسێتیی: خواردنی ژەمی سووكو شلەمەنیی، لەنێوان ژەمەکاندا.

هەستکردن بەونکردنی شتێك: خواردنی چەرەسات، خۆخەریککردن بەشتێکەوە وەك مۆبایلو قەڵەم..

ئۆقرەلێبڕانو بێتاقەتبوون: چوون بۆ باخچەکانو پیاسەکردن لەگەڵ خۆشەویستانتدا، خۆشۆردنو وەرزشکردن.

تووڕەبوون: خواردنەوەی ئاوی ساردو خۆفێنککردنەوە.

سەرئێشە: ئاوخواردنەوەی زۆر، خۆشۆردن، وەرزشکردن.

قەبزبوون: خواردنی خۆراکی دانەوێڵەیی، میوەو سەوزەی نوێو وەرزشکردن.

ح. لەهەموو ئەمانە گرنگتر:

داواکردنو پشتبەستن بەخودا، ڕاستکردن لەگەڵ خۆتدا، لەناخەوە بڕیاردانو ئازایەتییو دلێریی!

٧. لە کۆتاییدا:

گەر هەر سووریت لەسەر جگەرەکێشانو سەرکەوتوو نەبوویت لەوازهێنان، تکایە:

خەڵکی ئازار مەدەو زیان بەخەڵکی مەگەیەنەو لەشوێنێکی جیاکراوە بیکێشە.

لای خەڵکی جوانی مەکەو ڕێگە مەدە، منداڵو ئازیزانت بیکێشن، نائومێد مەبەو بەردەوام هەوڵ بدە وازی لێ بهێنیت.





# سوودە تەندرووستییەکانی سپێناخ

سـوودە تەندرووسـتییەکانی سـپێناخ زۆرن، بەهۆی زۆریی پێکهاتەکانـی لە ڤیتامینەکانو مـاددە خۆراکییەکان، یەك کووپ سـپێناخ زیاتر لـە پێویسـتییەکانی ڕۆژانەی لـە ڤیتامین(A)، ڤیتامیـن (E)، ڤیتامیـن (K)، ترشـی فۆلیـكو مەنگەنیـزو مەگنیسـیۆم تێدایە، هەروەها سەرچاوەیەکی گرنگی ڕیشاڵەکانو کالیسیۆمو پرۆتینە، لەگەڵ ئەوەشدا نرخی هەرزانەو دەتوانرێت بەلایەنی کەمـەوە، هەفتەی یەك جار بخورێت. وزەی گەرمی لە یەك کووپ سپێناخ دا تەنها ٤٠ کالۆررییە.

## یەکەم: نەخۆشیی شێرپەنجە:-

سـپێناخ زیاترلـە ١٥ جـۆر لـە توخمەکانـی فلافۆنۆیدی دژەئۆکسـێنەریان تێدایە، کـە زۆر بەهێزو چالاکـن یارمەتیی پاراستنی لەش دەدەن لە نەخۆشیی شێرپەنجە. لێکۆڵینەوەیەك جەخت لـەوە دەکاتەوە، ئەو ئافرەتانەی بەڕێکوپێکی سـپێناخ دەخۆن، هەلی تووشـبوونیان بە نەخۆشیی شێرپەنجەی مەمك زۆر کەمـە، هەروەهـا لـە لێکۆڵینەوەیەکی دیـدا دەرکەوتووە: سـپێناخ شـێرپەنجەی پێسـتو گەدە کـەم دەکاتـەوەو ڕێ لە گەشەکردنی دەگرێت، سەرەڕای بوونی کارۆتینەکان، کە ڕێگە لە زۆربوونی خانە شێرپەنجەییەکانی پرۆستات دەگرێتو وا دەکات خانە تووشبووەکان خۆیان لەناو بەرن، بوونی (فلافۆنۆید ایمی فیرول) لە سـپێناخدا، ڕێگـە نادات خانە شـێرپەنجەییەکانی هێلکەدان زۆر ببن.

## دووەم: نەخۆشییەکانی دڵو بۆرییەکانی خوێن:-

سـپێناخ بڕێکی زۆر لە ڤیتامین سـیو بێتاکارۆتینی تێدایە، هەردووکیان دژەئۆکسـێنەرنو پێکـەوە کاردەکەن؛ بۆ ڕێگەگرتن لە ئۆکسـانی کۆلیسـترۆڵی ناوخوێن، ئەمەش دەبێت بە ڕێگر لە تۆپەڵبوونی خوێنو بە خوڕ ڕۆیشتنی لە خوێنبەرەکاندا، هەروەها بوونی مەگنیسـیۆمو توتیاو سـیلینیۆم تێیـدا، یارمەتیی نزمیی فشـاری خوێن دەدات. سەرەڕای ئەوەی سـپێناخ، دەوڵەمەندە بە ڤیتامین A، ئەمەش یارمەتیی پاراستنی پێستو وشکنەبوونەوەی دەدات، بـەوەش لە چرچولۆچیو دەرکەوتنی زیپکەو نەخۆشـیی بەڵەکی دەیپارێزێت.

## سێیەم: بەهێزکردنی کۆئەندامی بەرگری

بوونی ڤیتامینە گرنگەکانی ئەیو ئیو سی، بۆ تەندرووستیی مرۆڤ زۆر بەسوودن.

یەك کووپ سـپێناخ، سـێ هێندەی پێویستی ڕۆژانە ڤیتامین ئـەی تێدایـە، ئەویـش توخمێکی سـەرەکیی خانـەی خڕۆکە سـپییەکانە، کە بەرەنگاری نەخۆشییەکان دەبێتەوە لە لەش داو بەرگریی لەش بەهێز دەکاتو لەش لە هەوکردن دەپارێزێت.

## چوارەم: چارەسەری کەمخوێنی دەکات

هەمیشـە شـارەزایانی خۆراك، جەخت لە خواردنی سـپێناخ دەکەنەوە بۆ چارەسـەری کەمخوێنی، تەنهـا ١٠٠ گم لە گەڵاکانی سپێناخ، دەتوانێت ٢٥ ٪ پێویستی ڕۆژانەی ئاسن دابین بکات، ئەو بڕەش یارمەتیی بەرهەمهێنانی خڕۆکە سوورەکانی خوێن دەدات.

بەگشتی، سپێناخ چەند سوودێکی دیکەی هەیە، ئەوانیش:

* لەماوەیەکی کەمدا، یارمەتیی سارێژبوونەوەی برین دەدات.

* شانەکانی لەش بنیات دەنێت.

* پارێـزگاری لە تەندرووسـتیی چـاو دەکاتو ڕێگری لە تێکچوونی پەیوەندیدار بە ڕوودانی فەوتان لە تۆڕەکانی چاودا بەهۆی پیربوونو بەساڵاچووندا دەکات.

* کار دەکات لە دابەزاندنی ڕێژەی چەوریو کۆلیسترۆڵی خوێن.

* چارەسەری قەبزی دەکات، بەهۆی بوونی بڕێکی زۆر لە ڕیشاڵ.

* بوونـی مەگنیسـیۆم لە سـپێناخدا، کاریگەری لەسـەر هۆرمۆنـی ئەنسـۆلینو زیادکردنـی چالاکـی هۆرمۆنەکە لە ڕێکخستنی ئاستی شەکر لە خوێندا.

* هەلی تووشـبوون بە نەخۆشـییەکانی دەمار، بە ڕێژەی ٧٠٪ کەم دەکاتەوە.

* دەرکەوتنی نیشانەکانی پیری دوا دەخات، بەهۆی بوونی مادەی (وتین)ی دژە ئۆکسێنەر تێیدا.

* بەسـوودە بـۆ ئـەو منداڵانـەی بەدەسـت گرژییـە دەمارییەکانەوە دەناڵێنن.



# مەترسیدارترین دوژمن

و: ئاسیا صەلاح

کچو کوڕەکانم، ناسینی دوژمنی گەورەو ڕکابەری سەرسەختتان شتێکی گرنگە، تا بتوانن بەهەموو هەوڵتان بەرەورووی ببنەوە، دەزانن ئەو دوژمنەش کامەیە؟

بریتییە لە: کەمتەرخەمی لە خوددا (سستی)و لاوازی کەسێتی. ڕەنگە بڵێن: کەمتەرخەمیی خودی چییە؟ منیش دەڵێم: مەبەستم پێی، لە ئاستدا نەبوونی توانای مرۆڤ، یاخود کەمیی وەبەرهێنانی، هەروەها لاوازیی ئیرادەیەتی لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی ئارەزووەکانی‌و بەرپرسیارێتی هەڵگرتنی. هەمیشە زۆر ئاسانە بۆ هەر یەکێکمان، کە کەسێك، لایەنێك، ڕووداوێك، یاخود بارودۆخێك ... بکات بە بیانوو؛ بۆ کەوتن‌و کێشەکانی، بەڵام ئەمەش لە زۆربەی کاتدا، ڕێی تێ ناچێت‌و سوودیشی نییە. کاتێك موسوڵمانان شکستیان هێنا لە جەنگی ئوحوددا، هەندێکیان وتیان: چۆن دەبێت ئێمە ببەزین، کە سەربازی خوداین، لە بەرامبەردا فەرموودەی خودای گەورە دابەزییە خوارەوە: ﴿أَوَلَمَّا أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ آل عمران: ١٦٥. (واتە: ئەرێ ئێوە بۆکە موسیبەتێکتان بەسەردا هات لە جەنگی ئوحوددا، حەفتا کەستان لێ کوژرا، وتتان ئەم موسیبەتەمان لە کوێوە تووشبوو؟ خۆ خودا بەڵێنی پێ دابووین کە یارمەتیمان بدات‌و سەرمان بخات! کەچی ئێوە لە جەنگی بەدردا دوو هێندەتان زیان لە کافرەکان داو حەفتاتان لێ کوشتن‌و بەدیلگرتن؟ ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ئەو بەڵاو کزییەی تووشتان هاتووە، خەتای خۆتان بوو کە بەگوێی پێغەمبەرتان نەکرد. خودا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایەو دەتوانێت سەرتان بخات‌و دەشتوانێت زیانتان لێ بدات). دڵنیابن کچو کوڕەکانم، هیچ کەس ناتوانێت ئازارتان بدات بەبێ مۆڵەتی خۆتان، دڵنیاشبن مرۆڤ لە توانایدایە کە ئازار بە خۆی بگەیەنێت لە هەر کەسێکی دی زیاتر ئەم وتەیەش بەسەر هەموو کۆمەڵ‌و نەتەوەو ئومەتەکاندا جێبەجێ دەبێت.

کەمتەرخەمیی خودی لە چەندان لایەندا خۆی دەبینێتەوە، وەك:

١- نەبوونی ئامانجی ڕوون کە هەوڵی بۆ بدرێت، بگرە زۆرینەی گەنجان نازانن چیشیان دەوێت، ناشزانن ئەو شتە چییە کە دەکرێت جیاوازیی دروست بکات، لەوەی کە ئێستا چین‌و دوای سێ ساڵی دی دەبن بە چی. هیوا هەیە، ویست هەیە، خەون هەیە، ئاوات هەیە، بەڵام هیچ ئامانجێك بوونی نییە. کاتێك ئامانج ڕوون‌و دیاریکراو نابێت، ناتوانێت خاوەنەکەی هان بدات لەسەر کارکردن‌و بەخشین‌و هەوڵدان، ئەمەش ئەوەیە کە زۆرینەی پیاوان‌و ئافرەتان‌و گەنجان پێوەی دەناڵێنن.

٢- تەممەڵی‌و هیمەتساردی، بەهۆی ساردوسڕیی پاڵنەرو هاندەرەکانی کارکردنەوەیە. یەکێك لە حەکیمان دەڵێت: مرۆڤ هەرگیز لاوازو بێتوانا نییە، بەڵام ئێجگار تەممەڵە. دەبێت بزانین کە کاری زیادە، ئەنجامی زیاتریشی هەیە، بەفیڕۆدانی کات‌و ئەنجامدانی کارەکان بەخاوی‌و تەممەڵی بەدڵنیایی ئەنجامیشی لاواز دەبێت.

٣- نارێکی بەشدارە لە کەموکووڕیی خوددا، بەتایبەتتر لەم سەردەمەدا، لە سەردەمێکی ئێجگار ئاڵۆزدا دەژین‌و داواکارییەکانی زۆرن، هەلەکان تێیدا مەزەندە ناکرێت، هەر بۆیەش پێویستی بە ڕێکخستنی خودو پلەبەندکردنی کارە لەپێشەکانە. هەوڵ بدەن ڕۆژانە کارێکی باش ئەنجام بدەن، وەك خوێندنەوەی بەشێك لە قورئانی پیرۆزو پاراستنی نوێژی بەکۆمەڵ‌و خوێندنەوەی کتێبێکی باش بۆ کاتژمێرێك، گەشتن بۆ شوێنی کار لە کاتی خۆیداو ئەنجامدانی کارێکی خۆبەخشانە... ئەمانە نارێکی لە ژیانتاندا سنووردار دەکات.

٤- بەفیڕۆدان، دوژمنی سەرسەختی ناخە گەورەو خواستە بەرزەکانە، ئێمەش زۆرمان لەبارەی زیانەکانی بەفیڕۆدان بیستووە، سەرەڕای ئەمەش، زۆربەی کەس بەپێی ئەم وتەیە دەڕۆن: " هەر شتێك کە دەتوانیت، بەیانی ئەنجامی بدەیت، ئەمڕۆ ئەنجامی مەدە! " بەفیڕۆدان جۆرێکە لە سستی‌و بێکاری‌و خۆدزینەوە لە ئەنجامدانی ئەرکەکان، سەرەنجامەکانی بریتییە لە: لەدەستدانی خێرو هەندێك لە خەسارەتمەندی. کات چاوەڕێی کەس ناکات، هەرکەس نەیتوانی کارەکانی ئەمڕۆ ئەنجام بدات، زۆر قورستر دەبێت گەر کارەکانی ئەمڕۆو ڕۆژانیتریش کۆببنەوە. نووری ئیمان لە دڵتاندا هەڵبکەن، بهێڵن ڕووناکییەکەی هەموو ژیانتان پرشنگدار بکات، واز بهێنن لە تەممەڵی‌و سستی‌و بەفیڕۆدان‌و نادیاری‌و نارێکی، بە پشتبەستن بە خودای بەخشندەو میهرەبان‌و دانا.

٥٠ مۆم بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەتان — مۆمی ٣٨ — بۆ کوڕو کچە لاوەکانم



# دروستکردنی را

## ئەو شتانەی باوکم، لە ژیاندا پێی نەگوتووم!

و: چیمەن لەتیف

ئێمە نەتەوەیەکی سۆزدارین، وتەی جوان کارمان تێ دەکات، وتاری ئاگرین حەماسەتمان وەجۆش دەخات، هێندە بەسە ژێی سۆزداریی کەسێك بلەرێنیتەوە؛ تا وەمەبەستی خۆت بگەیت.

سۆزداری نە خەوشە، نە شتێکی بێزراوە، تا مرۆڤ لە رەفتاریدا، دژی سۆزداری بوەستێتو بێبەرێتیی خۆی پیشان بدات، بەپێچەوانەوە لەزۆر جێگادا، سۆز دەمانجوولێنێتو زۆر واتای گەورەمان لا دەوروژێنێت، ئەو کەسەی تەواشای کاری خۆبەخشو خێرخوازانەی گەلان دەکات، دەبینێت گەلان بێتو پەرۆشیان وەجۆڵە بخرێت، ئاواتو کردەوە جوانەکانیان ئاور بدرێت، توانای تەواوکردنی کاری نەکردەو نۆژەنکردنەوەی گێتیان هەس.

ئیسلام (ئایینی ئاشتی) وەك دینێکی ئاسمانی، رووبەرێکی فراوانی پێکدێت لە سۆزداریو رۆحانیات، کە دەتوانێت نەرمونیانیو ئاشکرایی لە دڵی نەوەو هەلگرانی باوەڕەکەیدا بڵاو بکاتەوە.

ئەگەر سۆز بەکۆتی هزرو ژیربێژی، لغاو نەکرێت؛ ئەوا لە رێگای خۆی لا دەدات، تووشی کۆمەڵێك خەوشو ئاریشەی شەخسیمان دەکات.

یەکێك لە خەوشەکان کە گرنگترین کەموکووڕییە لە کەسێتی سۆزداریدا "کەسی سۆزدار، کەسێتییەکی جێگیری نییە" واتە: پێوانەیەکی ئاشکراو چەسپاوی بۆ ڕا دەربرینو ڕەخنەگرتن نییە.

کەسی سەنگین، کاتێك بۆچوونی لەبارەی شتێك دەچەسپێنێت، یان ڕایەك دەردەبڕێت، یاخود بڕیارێك دەدات، هەستو سۆزی تێکەڵ بەو کارانە ناکات، بەڵکو ئەوەی لەوێدا باڵادەستە، هۆشێکی لغاوکراوە لەسەر کۆمەڵێك پێوانەو بنەمای پتەوو جێگیر. بەداخەوە ئێمە لە جیهانی ئیسلامدا، بەشێوەی تاکەکەس، یان وەشێوەی کۆمەڵ ئەم خەسڵەتەمان تێدا گومە.

لەسەر بنەمای سۆزداری، خۆشەویستیی کەسێك، ڕایەك پەسەند دەکات، یان بۆچوونێك دەردەبڕێت، دژایەتیی کەسێك، یان بیرۆکەیەك دەکات، ڕەخنە دەگرێت، یان بە کەسێکدا هەڵدەدات، بەهەمان شێوە، بەڵگەکانی سۆزدارییە.

ئێمە لە سادەترین بنەماو پێوانەدا، لە چۆنێتیی ڕەخنەگرتنو رادەربڕیندا هەژارین... سەری زمانو بنی زمانمان: "ئەوەی لەگەڵمدا بێت پیرۆزە، هەرکەسێك دژایەتیم بکات ئەهریمەنە".

هاوڕێ، ئەوە هیچکات کارێکی عاقڵانە نییە!.. ئامۆژگاریم بۆ تۆ ئەوەیە: بۆچوونەکانت بە ژیربێژی تەیار بکەیت، بەر لەوەی ڕەخنە بگریت، هەست بکەیت؛ چونکە بەزۆری ڕاستی، چەندان ڕووی هەیە.

لە سەرووی ئەمانەوە، پێویستە ئاگاداری شتێکی زۆر گرنگ بین، ئێمە ڕەخنە لە بەشی شتێك، یان کارێك دەگرین، ناکرێت ئەو بۆچوونە گشتگیر بکرێت. لەوانە: کاتێك ئەم بابەتەم دەخوێنیتەوە بەلاتەوە جوان بێت، یان تێگەیشتنی بۆ تۆ گران بێتو پەشیمان بیت لەو برە پارەیەی بەم گۆڤارەت داوە.

هاوڕێ، نە ئەم بۆچوونەو نە ئەو ڕایەش، خوێندنەوەی بابەتەکە، کارێکی کرد کە ڕای خۆت بەیەکجاری دەرببڕیت، لەوانەیە ڕێکخستنو دارشتنی وشەو واتاکان، بابەتەکەیان بەلاتەوە جوان کردبێت، بەڵام لە ژیانداو لەزۆر شتدا لەگەڵیدا هاوڕا نەبیت، دەشێت پێچەوانەکەی بەلاتەوە پەسەند بێت، شایەد نەتوانیت هزرو ئارەزووەکانت بخەیتە ژێر ڕکێفی تێزەکانی ئەم پەرتووکەوە، بەڵام لەڕاستیدا نزیك بێت لە بیرکردنەوەو هزرت.

ئەگەر ڕات هەبوو، با لەسەر بابەتەکە بێت، نەك نووسەرەکەی، زۆر بەسادەیی، لێرەدا جیاوازیی خۆت لەگەڵ نووسەرەکەیدا پیشان دەدەیت، بەڵام نووسەرت وەك ئادەمزادێك پێ قەبووڵە.

لە بەشێك لە دەورانی ژیانمدا، لەبارەی بیرو بۆچوونەکانم زۆر پەرگیربووم، ئەگەر هاوڕام بویتایە؛ ئەوا لە گۆشەیەکی دڵمدا جێگاتم دەکردەوە، ئەگەر بۆچوونەکانمان تەبا نەبوایە؛ ئەوا شەرم پێدەفرۆشتیت.

سوێند بە خودا، چەند زەرەرم کرد بەهۆی ئەوکارەوە، کەسانێك بوون بە دوژمنم، بێئەوەی شەڕێکی ڕاستەقینە لە نێوانماندا ڕووی دابێت. یەکێك لە چەندان شتدا هاوڕایە لەگەڵمدا، لە شتێکدا بۆچوونمان ناکۆکە، کاتێك پێك دەگەین بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر قسە لەسەر ناکۆکیەکانمان دەکەین، یان ئەوەتا سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە، یان دژیەتیو ناکۆکی.

لە ڕابوردوودا، بەم شێوەیە خۆم گەیاندە لێواری تیاچوون. پاش «چەندان زەرەر»، فێربووم کە بیرو ڕا، نابێت لەسەر بنەمای سۆزداری بێت، هەروەها فێربووم نابێت بەشێوەیەکی کۆتایی بڕیار لەسەر هیچ کەسێك بدەم، لەسەرو ئەمانەوە دڵنیابووم کە هەمیشە من لەسەر حەق نیمو گومانی هەڵەکردنم زۆرە، لەبەر ئەو هۆکارانە، پێویستە بەخۆبەکەمزانینو زەردەخەنەوە، بیروڕاکانم دەرببڕمو ڕەخنەکانم بخەمە ڕوو.



# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

## مانگی ١٠

خوێنەرانی ئەزیز، وەك دەزانن ئەم مانگە مانگی تشرینی یەکەمە، بێگومان کۆمەڵێکی زۆر لە مرۆڤەکان، لەم مانگەدا چاویان بۆ ژیان هەڵهێناوە، هەروەکو لە ژمارەکانی ڕابــوردوودا، باسمان کــردووە، ئێستاش دووبــارە جەخت دەکەینەوە، هەڵسەنگاندن بەپێی مانگی لەدایکبوون، پەیوەندی بە سیفەتی مرۆڤەکانەوە هەیە بە درێژایی ژیانیان، دەروونناسان لەخۆڕا ئەم سیفەتانەیان دیاری نەکردووە، بە دڵنیاییەوە پاش ئەزموونو تاقیکردنەوەی کەسانێك، کە وەکو نموونە وەرگیراونو ڕەچاوو تێبینی هەڵسوکەوتیان کراوە، دواجار گەیشتوونەتە ئەم دەرەنجامە.. دووبــارە بە بەڕێزتانی ڕادەگەیەنین، مەرج نییە هەموو ئەو کەسانەی لەم مانگەدا لەدایکبوون، دەقاودەق خاوەنی ئەم سیفەتانە بنو بە موو لێی لانــەدەن، نا بەڵکو ئەوە لەسەر بنەمای زۆرینەیەو دەگونجێت زۆرینەی ئەو کەسانەی لەم مانگەدا لەدایك بووبن، خاوەنی ئەم سیفەتانە بن، هیوادارم ئێمەش توانیبێتمان وەکو ئاوێنەیەك سیفەتەکانتان نیشان بدەین بە جوانو ناشیرینیانەوە، بەو هیوایەی بتوانین زیاتر برەو بە سیفەتە جوانەکان بدەینو سیفەتە ناشیرینەکانیش لە خۆمان دابڕنینو لێیان دوور بکەوینەوە..

**سیفەتەکانی ئەو کەسانەی کە لە مانگی تشرینی یەکەم (١٠) چاویان بە ژیان هەڵهێناوە:**

١- حەز بە زۆر قسەکردن دەکەن، واتە: ڕقیان لە بێدەنگییە.

٢- هەموو ئەو کەسانەیان خۆش دەوێت، کە خۆشیان دەوێن، واتە: هەرکەس ئەوانی خۆشبووێت، ئەوانیش خۆشیان دەوێن.

٣- حەزدەکەن لە نیوەی ڕێدا دەست بە گۆچانەکەیانەوە بگرن.

٤- کەسانێکی نەرمونیانو سەرنجڕاکێشن!

٥- چێژ لە جوانییە ڕواڵەتیو ناوەکییەکان دەبینن!

٦- درۆناکەنو ڕقیان لە درۆکردنە، هەروەها تەمسیل ناکەنو لەسەر شێوەی خۆیان دەردەکەون.

٧- مامەڵەکردنیان لەگەڵ هاوڕێکانیان، بەپێی گرنگیدانی ئەوانە بۆیان، واتە: ئەوان چەندە گرنگیان پێ بدەن، ئەوانیش بەهەمان شێوە گرنگیان پێ دەدەن، بە واتایەکی دیکە بڵێین: ئەگەر کەسێك گرنگیان پێ نەدات، ئەوانیش فەرامۆشی دەکەنو گرنگی پێنادەن.

٨- حەز بە دامەزراندنو درووستکردنی هاوڕێیەتی دەکەن.

٩- کاتێك کەسێك هەڵدەبژێرن، بۆ هەمیشەیی هەڵی دەبژێرن، واتە: دۆستی کاتی نین، بەڵکو هاوڕێو دۆستی هەمیشەیین، لە ناخی دڵەوە هەڵبژاردەکانیان خۆش دەوێت!

١٠- حەز بەخەوبینینی ئاواتی زیندووانە دەکەن، واتە: خاوەنی خەونو هیواو ئاوات گەلێکن، کە بەدیهاتنیان ئاستەم نییە.

١١- گرنکی بە بە بیرکردنەوەو ڕای کەسانی بەرامبەری نادات، واتە: گوێ نادات بەو قسانەی لەبارەیەوە دەوترێن.

١٢- کەسانێکن خاوەن سۆزو میهرەبانیو گوفتار شیرینو زۆر ڕۆمانسین.

١٣- کەسانێکن زوو کۆتایی بە کێشەو گرفتەکانیان دەهێنن لەگەڵ بەرامبەردا، واتە: درێژە بە ناکۆکییەکانیان نادەن.

١٤- حەز بە گەشتو گەڕانو ئەدەبو هونەر دەکەن.

١٥- حەز بە شوێنی کراوە دەکەنو ڕقیان لە شوێنی داخراوە.

١٦- ڕۆحسووکن هەموو ئەو کەسانەیان خۆش دەوێت کە چێژ دەبینن لە ڕۆحسووکو خوێنشیرینەکان.

١٧- دادپەروەرو بە ویژدانن.

**خاڵە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی ١٠ لە دایکبوون:**

١- بە ئاسانی بریندار دەبن، واتە: دڵیان هەم هەستیان ناسکە.

٢- میزاجی خراپە، بەپێی جۆری ئــەو کەسەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات.

٣- زۆر قسەدەکەنو مافی بەرامبەریش دەخۆن لە قسەکردندا.

٤- زۆر ئیرەیی دەبــەن، کاتێك کەسێك بێزاریان بکات زوو هەڵدەچنو تووڕە دەبن.

٥- دوودڵو ڕاڕان.

٦- کەسانێکی دەســتبــڵاونو بەئاسانی کاریگەرییان لەسەر درووست دەکرێت.

٧- بەخێرایی متمانەبەخۆبوونیان لەدەست دەدەن..






# فیراسەتی
# هەیاسی خاس..

لە بابەتی ئەمجارەدا، باس لە زیرەکیو بیرتیژی هەیاسی خاس دەکەین، هەیاس کەسێکی زیرەكو لێهاتوو، دووربینو بە ئەزموون، حەکیمو دانا، دادوەرێکی دادپەروەر بوو، چیرۆکی زیرەکیو لێهاتوویی هەیاس، ناوبانگی شاری پڕ کردبوو، بە ئەندازەیەك نەك هەر خەڵکی شارەکەی خۆی، بەڵکو خەڵکی شارەکانی دیکەش، چەندان کیلۆمەتریان دەبڕیو دەچوونە خزمەتی هەیاسی خاس؛ تا کێشەو گرفتەکانیان بۆ چارەسەر بکاتو کۆتایی بە ناکۆکییەکانیان بهێنێت، یاخود بۆ پرسیارکردن سەبارەت بە دینو زانست؛ چونکە کەسێکی خاوەن زانستو دادپەروەرێکی کەموێنە بوو.

لەبارەی هەیاسی خاسەوە، چیرۆکگەلێکی زۆر هەیە، بەتایبەت لە بواری دادوەریو سەرخستنی ستەملێکراوان، لەم ژمارەیەدا، باس لە یەکێك لە چیرۆکە دادوەرییەکانی هەیاسی خاس دەکەین:

لە شاری کوفە، کابرایەك هەبوو، لە نێو خەڵکیدا بە سەرڕاستو دەستپاك، چاکەخوازو دونیانەویست ناوبانگی دەرکردبوو، خەڵکی زۆر ستایشیان دەکرد، هەندێك لە خەڵکی، وەکو کەسێکی ئەمینو دەستپاكو باوەڕپێکراو، کاتێك گەشتیان دەکرد، پارەو سامانەکانیان لەلای ئەو دادەنا، ڕۆژێکیان پیاوێکی خەڵکی کوفە، بە مەبەستی بەجێهێنانی فەریزەی حەج، گەشت دەکات بۆ شاری مەککەی پیرۆز، بۆ ئەم مەبەستە دەڕواتە لای ئەم ئەمیندارو چاکەخوازو دەستپاکە، کە ناوبانگی، کووچەو کۆڵانەکانی پڕ کردبوو، پارەو سامانەکەی بە ئەمانەت لەلا دادەنێت، تا ئەو کاتەی لە سەفەری حەج دەگەڕێتەوە، پاشان خاڵۆی ڕێبوار بەڕێ دەکەوێت بەرەو شاری مەککەی پیرۆز، دوای تەواوکردنی فەریزەی حەج، دەگەڕێتەوە کوفەو دەڕوات بۆ لای ئەمیندار؛ تا ماڵەکەی وەربگرێتەوە، بەڵام ئەوەی چاوەڕوانی نەدەکرد، ڕووی دا، دیارە پارەی خاڵۆی ڕێبوار زۆر بووەو بەری دڵی گرتووە، لەبەرئەوە ئەمیندار حاشای لێ دەکاتو دەڵێت هیچ ئەمانەتو پارەیەکی تۆ لای من نییە. ئەم وەڵامە، سەری خاڵۆی ڕێبوار دەسوڕمێنێت، هەرچەندە پێداگریی دەکات، بۆ وەرگرتنەوەی ماڵەکەی، ئەمیندار زیاتر نکۆڵی لێ دەکات!

خاڵۆی ڕێبوار، بە ناچاری ملی ڕێ دەگرێت، بۆ لای هەیاسی قازیو تەواوی چیرۆکەکەی بۆ دەگێڕێتەوە..

هەیاس بە خاڵۆی ڕێبوار دەڵێت: ئایا جەنابی ئەمیندار، دەزانێت کە تۆ هاتوویت بۆ لای منو سکاڵات لە دژی تۆمار کردووە؟

خاڵۆی ڕێبواریش دەڵێت: نەخێر، قوربان.

هەیاس: ئایا لای کەسی دیکە، ئەم کێشەیەت باس کردووە؟

خاڵۆی ڕێبوار دەڵێت: نەخێر.

هەیاس پێی دەڵێت: ئەم بابەتە لای هیچ کەس باس مەکە، ئێستا بڕۆ دوای دوو ڕۆژی دیکە وەرەوە بۆ لام.

پاشان هەیاسی خاس، کەسێك دەنێرێت بۆ لای کاکی ئەمیندار، بانگهێشتی دەکات بۆ لای خۆی، کاتێك ئەمیندار دێتە لای هەیاسی خاس، هەیاس پێی دەڵێت: ماڵو سامانێکی زۆری منداڵە بێباوکەکانمان لەلایە، کەس شك نابەین لەلای دابنێین، دەمانەوێت تۆ بکەین بە سەرپەرشتیاری ئەو ماڵە، ئایا شوێنێکی تۆکمەو فراوانت هەیە؟

جەنابی ئەمینداریش بەخۆشحاڵییەوە دەڵێت: بەڵێ، جەنابی قازی.

هەیاسی خاس: زۆر باشە، بڕۆ شوێنێکی مەحکەمی بۆ ئامادە بکەو دوو ڕۆژ دیکە تەشریف بهێنەرەوە بۆ لامو ماڵو سامانەکە بگوێزەرەوە بۆ لای خۆت.

بۆ ڕۆژی دواتر، کابرای خاوەن ئەمانەت هاتەوە بۆ لای هەیاسی خاس. جەنابی قازی وتی: هەر ئەمڕۆ بڕۆ بۆ لای بەناوئەمیندارو داوای ماڵەکەتی لێ بکەرەوە، ئەگەر پێی دایتەوە لێی وەربگرە، ئەگەر نکوڵی لە دانەوەی کرد، پێی بڵێ ئەگەر ماڵەکەم نەدەیتەوە، دەڕۆم بۆ لای هەیاسی قازیو سکاڵات لەسەر تۆمار دەکەم!

بەو شێوەیە کە هەیاس پێی وت، خاڵۆی ڕێبوار ڕۆیشتەوە بۆ لای ئەمیندار پێی گوت: هاتووم ئەمانەتەکە بدەیتەوە، دووبارە ئەمیندار نکووڵی کردو وتی: هیچ شتێکی تۆم لانییە، خاڵۆی ڕێبوار پێی گوت: ئەگەر نەمدەیتەوە، ناچارم بڕۆم بۆ لای جەنابی قازیو سکاڵا لە دژی تۆ تۆمار بکەم، ئەمیندار بە بیستنی ناوی هەیاسی خاس، داچڵەکیو بەپەلە ڕۆیشت ئەمانەتەکەی بۆ هێنایەوەو بۆی گەڕاندەوە.

خاڵۆی ڕێبوار بە خۆشحاڵییەوە گەڕایەوە بۆ لای هەیاسی خاسو زۆر سوپاسی کردو وتی: هەر کە ناوی بەڕێزتانم هێنا، دەستبەجێ ماڵەکەی بۆ گەڕاندمەوە!

بۆ ڕۆژی دواتر ئەمیندار بە خۆیو چەند کرێکارێکەوە هات بۆ لای هەیاسی خاس، بۆئەوەی ماڵو سامانی بێباوکەکان بگوازێتەوە بۆ ماڵی خۆیان، بێئاگا لەوەی کەوتووەتە ناو داوەکەوەو ڕووی ڕاستەقینەی ئاشکرا بووەو ئێستا لای قازی، نەك ئەمیندار نییە، بەڵکو دەستبڕو حەرامخۆرە، هەیاس هەر کەچاوی پێکەوت، زۆر بەتوندی ڕووبەڕووی بووەوەو لێی تووڕە بوو، پێی گوت: ئەی دوژمنی خودا، تۆ نەك ئەمیندار نیت، بەڵکو خراپترین پیاوی، دەتەوێت بە ڕووکەشت، خەڵکی فریو بدەیت، دین بۆ بەرژەوەندیی خۆت بەکار بهێنیت، دوور بکەوەرەوە لێم، ئەی ناپاك جارێکی دیکە، لێم نزیك نەبیتەوە.

بەمشێوەیە بە حیکمەتو دانایی هەیاسی خاس ماڵو سامانەکەی بۆ خاڵۆی ڕێبوار گێڕایەوە، بێئەوەی زیندانو لێدانو کوتەك بەکاربهێنێت، هەم ڕوی ڕاستەقینەی ئەو بەناو ئەمیندارەی ئاشکرا کرد، هەم ماڵی بۆ ستەملێکراوو ماف خوراو گێڕایەوە.

# وەڵامی بەجێ

کەسێك چوو بۆ لای دانایەکی دنیادیدەو پێی گوت: فڵان کەس قسەی پێ دەگوتیت!
داناکەش گوتی: فڵان تیرێکی تێ گرتمو نەیپێکام، باشــە بۆچی تۆ، هەڵی دەگریتەوەو
لە دڵمی دەچەقێنیت؟!

ئەســکەندەری مەکدۆنی، پیاوێکی هەژارو نەدارو جلشــڕی پینەداری دی، لێی پرسی: ناوت
چییە؟ پیاوەکەش گوتی: ئەسکەندەر. ئەسکەندەر تووڕەیی گرتیو گوتی: چۆن دەبێت هەژارێکی
وەك تــۆ، ناوی منــی هەبێت؟! هەژارەکەش گوتی: قوربان، جا ئەگەر پێت ناخۆشــە، یا ناوی
خۆت بگۆڕە، یا حاڵی من!

کابرایەك دزیی لێکرابوو. دز شەو چووبوونە سەریو چەند سەر مەڕوماڵاتیان بردبوو. بەیانی
خەڵك لە ســەر ڕووداوەکە دەدوان. یەك دەیگوت: خەتای خۆتە لەســەر هەست نەنووستوویت.
یەکێکــی دی دەیگــوت: خەتای کوڕەکەتە؛ دەرگای باش دانەخســتووە. کەســێکی دی دەیگوت:
خەتــای کچەکەتە؛ چرای بــەر ماڵی کوژاندووەتەوە. کابراش گوتــی: وا دیارە، خەتای هەموو
کەسێکە، دزەکە نەبێت!

پیاوێك لە پێشــەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیبی پرســی: بۆچی لەسەردەمی پێشەوا عومەردا
موســوڵمانان ناکــۆك نەبوونو پێکەوە شــەڕیان نەدەکرد، بەڵام دەبینین لەســەردەمی تۆدا،
موسوڵمانان ناکۆکنو بەشەڕ دێن؟
پێشەوا عەلی فەرمووی: لەبەرئەوەی پێشەوا عومەر، پیاوی وەکو منی هەبوو، بەڵام من،
پیاوی وەکو تۆم هەیە!





# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان

ناڕەحەتییەکان مرۆڤ وا لێ ناکەن، شکست بهێنێت،
بەڵکو بۆی دەسەلمێنن کە چی جۆرە پیاوێکە.

تۆماس یێ (سۆفیگەر)

با هەمیشـە خەیاڵێکی پڕ جۆش‌و خرۆشـت هەبێت؛
چونکە نازانیت کەی پێویستیت پێ دەبێت.

جی رولینج (نووسەر)

گەرمتریـن جێگەکانی دۆزەخ، بۆ ئەو کەسـانە گیراوە، کە لە
کاتی قەیرانە ئەخلاقییە گەورەکاندا بێلایەن بوون.

دانتی ئەلیجیری (شاعیر)

ئەگەر توانـای پێکەنینت لەدەسـت دا؛ ئـەوا توانای
بیرکردنەوەشت لە دەست دەدەیت.

ئانی دیلارد (نووسەر)

ناتوانی ئازایەتی بە وریایی‌و ترسەوە تاقی بکەیتەوە!

و: زانا قەرەداغی



# 12 ئامۆژگاری بۆ ئەوەی ببیتە داهێنەر

بۆئەوەی بیرکردنەوەت، بۆ بیرکردنەوەیەکی داهێنەرانە بگۆڕیتو ببیت بە کەسێکی ڕۆشنبیرو توانای لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوەت هەبێت؛ ئەوا بێگومان ئامۆژگاریت ناکەین بۆئەوەی ٢٤ کاتژمێر بەرامبەر بە کتێبخانەکەت دابنیشیتو بیر بکەیتەوە؛ چونکە کارەکە بەسادەیی کۆتایی دێت. لەبەرئەوەی تۆ کەسێکی تەممەڵی توانای بەدەستهێنانت نییە. لەبری ئەوە سوود لەم ئامۆژگارییە گرنگانەی خوارەوە وەربگرە.

**کۆمەڵەی یەکەم: لایەنی تەندرووستی**

١. ئاو بخۆرەوە: بەیانی هەستایت لەخەو کوپێك ئاو بخۆرەوە؛ بۆئەوەی لە سەرەتای ڕۆژەکەت چالاك بیت.

٢.جووڵە: ڕۆژانە بە شێوەیەکی ڕێکوپێك وەرزش بکە؛ چونکە وەرزش یارمەتیی بەرزکردنەوەی وزەی لەشی مرۆڤ دەدات؛ تا چوستو چالاك بێت، وەرزشی بەیانیان وات لێدەکات هەست بە ئارامیو ئاسوودەیی بکەیت، دوور بیت لە دوودڵی.

٣. ئاسوودەیی: هەوڵ بدە ڕۆژانە کەمێك ئاسوودەییو ئارامی بەدەست بخە؛ چونکە ئاسوودەیی لەش، پاڵنەرە بۆئەوەی کە تۆ کاری زۆر بکەیتو هەوڵ بدەیت.

**کۆمەڵەی دووەم پلانی درووست:-**

٤. ئەرك: ڕۆژانە لە یاداشتنامەکە سێ ئەرکی گرنگو بنچینەیی بنووسە، کە ئەمڕۆ ئەنجامی بدەیت.

٥. ١٠/٥٠: ئەوە یاسایی کارو ئاسوودەییە، دەتوانیت بۆ ماوەی ٥٠ خولەك لەسەر ئەرکە بنچینەییەکە کار بکەیت، پاشان بۆ ماوەی ١٠ خولەك پشوو بدەیت؛ تا جەستەت وزەیەك وەربگرێتەوەو چالاك بێت.

٦. هەڵسەنگاندنی خۆت: لە کۆتایی ڕۆژدا، بۆماوەی دە خولەکەك بەسەر کارەکانتدا بچۆرەوە، بزانە چیت ئەنجام داوە؛ بۆئەوەی هەڵەکانی ئەو ڕۆژە چاك بکەیتەوە.

**کۆمەڵەی سێیەم: بەردەوامبوون لە فێربوون:-**

٧. خوێندنەوە: بەخوێندوەی زۆر، ڕۆشنبیریت زیاد دەکات، پاڵنەرێکیشە بۆئەوەی داهێنانی زیاتر بکەیت.

٨. ئینتەرنێت: لە تۆڕی ئینتەرنێتدا، بۆ تۆژینەوەو بابەتە زانستییەکان بگەڕێ؛ تا ئاگاداری شتە نوێیەکانی بیت.

٩. بیرۆکەی ئاڵتوونی: هەرکاتێك بیرۆکەیەکی تازەت بۆهات، خێرا بینووسە؛ چونکە لە ئایندە، وات لێ دەکات ئەنجامی بدەیت.

**کۆمەڵەی چوارەم: بەدەستخستنی ئارامی:**

١٠. بیرکردنەوە لە بەیانیاندا: لە بەیانیدا بیر لە ١٠ شت بکەرەوە، کە حەزت پێیەتیو وات لێدەکات ئاسوودە بیت.

١١. پاکو خاوێنی: پاکو خاوێنیی نووسینگە، یان شوێنکارو دەوروبەرت، وات لێدەکات کە هەست بە ئارامی دەروونی بکەیت.

١٢. ئەو کارانەی لای تۆ بەهادارن: ئەوەی حەزت پێیەتی ئەنجامی بدە.

سەرچاوە: رسالة المرأة

10335=id?aspx.article/com.islammessage.woman//:http

# 10 زیرەکترین کەسایەتییەکانی جیهان



## 2 مارلین ڤۆس ساڤانت

نووسەری ئەمریکی مارلین، خاوەنی نازناوی «زیرەکترین ئافرەتی جیهان»ەو لە کتێبی گینس ناوی تۆمار کراوە، ئاستی زیرەکی دەگاتە ٢٢٨ IQ .

**کورتەیەك لە ژیانی:** مارلین لە ١١ی ئابی ١٩٤٦ لە ویلایەتی میسۆری لە ئەمریکا لە دایكو باوکێکی کۆچکردووی ئەڵمانیاو ئیتاڵیا لەدایك بووە، لە زانکۆی واشنتۆن، لە سانت لویس، لە بەشی فەلسەفە خوێندوویەتی، بەڵام دوای دوو ساڵ، وازی لە خوێندن هێناوەو دەستی کردووە بە کاری هاوبەشیو وەبەرهێنان بۆ یارمەتیدانی خێزانەکەی، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٠ ڕووی لە شاری نیویۆرك کرد؛ تا ببێت بە نووسەر، لەوێ گیرسایەوە، دەستی بە نووسین کرد، مارلین لەگەڵ «ڕۆبێرت»ی داهێنەری دڵی دەستکرد هاوسەرگیریی کردووە، دوو منداڵی هەیە بە ناوەکانی «مریەمو دێنیس».

**پرسیار لە مارلین بکە:** ئەمە ناونیشانی گۆشەیەکی هەفتانەیە لە گۆڤاری "موکب"کە تیایدا مارلین وەڵامی پرسیارە جۆربەجۆرەکانی دەدایەوە لە کاتێکی کەمدا، کە تا ئێستاش بەردەوامە، مارلین ناوی چووەتە ناو "ژنانی سەردەم"و ئەم نازناوەی پێدراوە لە لایەن هەڵمەتی ئافرەتە دیموکراتی خوازەکانو خەڵاتی (ئافرەت لە دروستکردنی مێژوو)ی پێبەخشراوە لە لایەن مۆزەخانەی مێژوویی نیشتمانی.

**چۆن ناوبانگی دەرکرد؟!**

لە تەمەنی ١٠ ساڵی بە هەردوو تاقیکردنەوەی (ستانفورد بینیە)و تاقیکردنەوەی (مێگا)دا ڕۆیشتوو، دەرکەوت کە نیشانەکانی زیرەکی لە ئاستێکی زۆر بەرزدایە، تەمەنی ژیریی ٢٣ ساڵ بوو لە کاتێکدا تەمەنی زەمەنی تەنها ١٠ ساڵ بووە، لەبەرئەوە ناوی لە کتێبی گینس تۆمار کرا بەناوی "زیرەکترین ئافرەتی جیهان" بەم شێوەیە ناوبانگی دەرکرد.

**بڕوانامەو بڵاوکراوەکانی:** لە ساڵی ٢٠٠٣ مۆڵەتی بڕوانامەی دکتۆرای وەکو ڕێزلێنان لە زانکۆی نیو جیرسی پێبەخشراوە، چەندەها کتێبی بڵاوکراوەی هەیە لە بوارە جۆراو جۆرەکاندا، هاوکات چەندین جار ڕووبەڕووی هەڵەو ڕەخنەگرتن بۆتەوە لە لایەن زانایانو مامۆستایانو خوێنەرانی گۆڤار، لەگەڵ ئەوەشدا سەرپەرشتیاری گۆڤارەکە"والتر اندرسون"دەڵێ: مارلین کەسێکی زۆر بلیمەتەو زۆر بە خێرایی وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوەو بەشێوەیەك بیریان لێ دەکاتەوە کە بڕیاری جەنگ بێتو لە هەموو ئاراستەکانەوە بۆی دەڕوانێت.

"کەواتە مرۆڤی سەرکەوتوو کەسێك نییە کە هەرگیز هەڵە نەکات، بەڵکو کەسێکە کە متمانەی بەخۆی هەبێتو بەردەوام بێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی، پێویستە فەرهەنگێکی زانیاری فراوانت هەبێت تا بتوانی بە ئاسانی مامەڵە لەگەڵ کەسانێکی زۆردا بکەیت.

**بۆ زیادبوونی هێزی ژیری:** مارلین ئاماژە بە چەند خاڵێك دەکات تا ببیتە کەسێکی زیرەكو خاوەن توانا لە هەر کارێك کە بتەوێتو ئارەزووی سەرکەوتنت هەبێت تیایدا:-

**١- هەناسەدانەوەی قوڵ:** زیادبوونی هەوا لە لەشدا مانای زیادبوونی ئۆکسجینە لە خوێندا، دەمت دابخەو لە ڕێگەی لوتەوە هەناسەوەربگرە تا سییەکانت پڕ دەبن لە هەواو چەند جارێك ئەمە دووبارە بکەوە، بەمەش پشوو دەدەیت بە لاشەتو بیرکردنەوەت فراوان دەبێت.

**٢- شێوازی بیرکردنەوە:** هەر ئێستا ئەم تەکنیکەی بیرکردنەوە جێبەجێ بکە، چاوەکانت دابخەو ئاگاییت ئاڕاستە بکە بەرەو ناخی خۆت، بیرکردنەوە یارمەتیدەرت دەبێت بۆ خاوبوونەوەی دەمارەکانتو هەموو تەرکیزت لە هەناسەدان دا کۆدەکاتەوە، بەم شێوەیە مێشکت ئامادەباشی خۆی وەردەگرێت بۆ هەموو بارودۆخیکی تایبەت.

**٣- دانیشتن لە سەر شێوازێکی ڕاست:** خۆت جێگیربکەو سەرت بۆ پێشەوە لاربکەوە بەڕوونی لە کێشەکان وردبەرەوەو دەمت دابخە، بەشێوەیەك کە کێشەکەش لەگەڵ تۆ دانیشتبێ، بەم شێوەیە دەبینی مێشکت زۆر بە باشی کاردەکات تا کۆتایی.

**٤- سایکۆلۆژیای بیرکردنەوەی دروست:** کارکردن بە تەکنیکێکی دیاریکراو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك دەبێتە هۆی ئەوەی ببێتە خوو نەریت، تا زیاتر لەسەر ئەو شێوازە دیاریکراوە بەردەوام بیت هێزی زیاتر پەیدا دەکەیت.

**٥- خێرا خوێندنەوە:** ڕاهێنانێکە بۆ مێشك، بە خێرا خوێندنەوە بە کاتێکی کەمتر، زیاتر فێردەبیت.

**٦-ڕاهێنانە وەرزشییەکان:** باشترین هێزە بۆ خانەکان بەتایبەتی ئەگەر بەردەوام بیت لەسەری بۆ ماوەیەکی زۆر، هەر شتێك کاریگەری هەبێت بۆ سەر لاشە کاریگەریشی دەبێت بۆ سەر مێشكو ئاڕاستەی دەکات بۆ بیرکردنەوەیەکی ئیجابیانە.

**٧- خۆ ڕۆشنبیرکردن:** لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە ژمارەیەکی زۆر کەم لەوانەی هەوڵی خوێندنو خۆڕۆشنبیرکردن دەدەن، ڕووبەڕووی نەخۆشی لەبیرچوونەوە "الزهایمر"دەبن.

**٨-کەم خواردن:** پابەندبە بە کەمخواردنو سیستەمی خۆراکی بەتایبەت ئەو خۆراکانەی وزەی زۆریان تێدایە سودی زیاتر دەبێت بۆ دەماغ.

**٩-نانی بەیانی:** ئەو منداڵانەی نانی بەیانیان پێ دەدرێت سەرکەوتووترن بە بەراورد لەگەڵ منداڵانی تر.

**١٠-پرسیارکردن:** هۆکارێکی زۆر باشە بۆ لەبەرکردنو عەقڵێکی لەبار.

ئا: نارین جووتیار



بەشی یەکەم

# چۆن کار لە کەسانی دی دەکەین؟

ڕێبوار سابیر
ماستەر لە مافەکانی مرۆڤ

بەشێکی زۆر لەزانایان، لەسەر یەك جۆر پێناسە ڕێکنەکەوتوون لەسەر ئەو زاراوانەی کە پەیوەندییان بە هەڵسوکەوتی مرۆڤەوە هەیە، بەهۆی فراوانیی ماناکانیانەوە. لە گرنگترین ئەو پێناسانەی بۆ (التأثیر) کاریگەری، یان کارتێکردن لەسەر کەسانی دی کراوە:-

یەکەم: ئاڕاستەکردنو هەڵسوکەوتو چالاکییەکی ڕێکخراوە لەلایەن تاك، دەستە، گرووپ دەکرێت بە ئاڕاستەیەکی گونجاودا لە ڕێگەی بەکارهێنانی چالاکییە جۆراوجۆرەکانی وەك: ئیداری، سەرکردایەتی، ڕێکخستن، سەرپەرشتی، مامەڵەکردن.

دووەم: کارتێکردن، ئەو هێزەیە کە ڕابەرو سەرۆك هەیەتیو لەڕێگەیەوە دەتوانێت کاریگەری درووست بکات لەسەر دەوروبەری.

سێیەم: زانایان پەیوەندیو تێکەڵاوبوونی خەڵکی بە یەکێك لە کاریگەرترین هۆیەکانی کارتێکردن دەزانن.

کەواتە: ئامانج لە کارتێکردن درووستبوونی گۆڕانکارییە لە بۆچوونو هەڵسوکەوتو ئاڕاستەو ڕەفتارو بیروباوەڕدا.

کارتێکردن دوو جۆرە:

١- بەدەستی دەهێنیت: واتە: زانستێکە پێویستی بە فێربوونو گەڕانو بەدواداچوون هەیەو دەبێت بەشێك لە کاتەکانی خۆتی بۆ تەرخان بکەیت، بە بەشداریکردنی خولو کۆڕو دیراسەو سیمینارو، خۆنەویستی...خوێندنەوەو بیرکردنەوەیەکی واقیعیانە.

بەدەستهێنانی هونەری درووستکردنی کاریگەری لەسەر خەڵکی، بۆ کەسانی خاوەن پەیامو هەڵگری ئایدیایەکی ڕۆشنو دەوڵەمەند لە مێژوویەکی کەڵەکە بوو، قوتابخانەیەکی گەورەی فیکریو میانڕەوو خزمەتگوزار، کارێکی ئاسانە.

شۆڕشگێڕە بەناوبانگەکانی جیهان، کە توانییان شۆڕشی گەورەی چاکسازی، ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤو ڕووبەڕووبوونەوەی ڕەگەزپەرستیو بەگژداچوونەوەو گەندەڵیو برسێتی بەرپا بکەن وەکو (گاندی، حەسەن بەنا، و تاد...)

٢- کارتێکردن بەهرەیە: واتە: لەگەڵیاندا هاتووەتە ناو دنیاوە، وەکو پێغەمەران «سڵاوی خودایان لێ بێت» خاوەن ئەو بەهرەیە بوون، پێغەمبەر «ﷺ» هەموو ساتەکانی تەمەنی جێگای سەرسامیو تێڕوانین بووە، پلەو پایەیەکی دیاری هەبووە بە هەڵسوکەتەکانی، گوتەو ئاماژەکانی کاریگەری لەسەر دەووروبەری درووست کردووە، متمانەی بەخشیوەتەوە بە مرۆڤەکان، هەموو وێستگەکانی ژیانی قوتابخانەی فێربوونو کاریگەری بووە لە ئاشتیو جەنگدا، لەگەڵ خێزانو هاوەڵو کۆمەڵگەو نەیارو دەوڵەتو تەنانەت ئاژەڵانیشدا.

هێزو هونەری کارتێکردن:-

بە سرووشت ئێمە بەدیهێنراوێکی خوداییین، ئەستەمە بتوانین بەتەنها بژینو دوور بکەوینەوە لە دونیای مرۆڤایەتیو خۆمان کەنارگیر بکەین، بۆیە حەز دەکەین لەگەڵ کەسانی دیکەدا، مامەڵە بکەینو خۆزگەش دەخوازین شوێنەواری باش لە دەروونیاندا جێ بهێڵین، ئاواتمانە متمانەی دەوروبەر بەدەست بهێنین، تێڕوانینێکی ئیجابیانە لای کەسانی دی بۆ خۆمان درووست بکەین، ئایا ئەو ڕێگایانە کامانەن، کە بەو ئامانجانەمان دەگەیەنن؟

(کاریگەریو کارتێکردن) دەتوانین بڵێین: هێزی کاریگەری، هونەرێکە، هەموو مرۆڤێك ناتوانێت پیادەی بکاتو یەکێکە لە گەورەترین توانا مرۆییەکان لە مرۆڤدا، بۆ درووستبوونی متمانەی بەرامبەر بەو ئایدیاو پرۆژەی کە هەڵی گرتووە.

دەبێت بزانین کاریگەری لەسەر ئەوانی دیکە، لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەست پێدەکات، لە مرۆڤی خاوەن بەهاو ئەزموونو زانیاریو ئاکاری جوان بۆ مرۆڤی کەمتر لەو وەسفانە ڕۆڵو

کاریگەری دەبێت، جا کاریگەرییەکە مادی بێت، یا مەعنەوی.
ئەمەش وەك لاساییکردنەوەی بچووك بۆ گەورە، لاواز بۆ بەهێز، هەژار بۆ دەوڵەمەند، قوتابی بۆ مامۆستاکەی، بازرگانی بچووك بۆبازرگانی گەورە.

زانیاری‌و خوێندنەوەی بەردەوام‌و بەدوای زانست گەڕاندا، سەرچاوەیەکی گرنگ‌و بەهێز دەبێت بۆ هونەری کارتێکردن.

مرۆڤی کەمتواناو کەمزانست، ناتوانێت کاریگەری درووست بکات، کەسی کاریگەر، پێویستی بە دامەزراوی لە هزرو بیروباوەڕو ئارامگرتن هەیە، کاتێك خەڵکی لەسەرەتای ڕێگادا سەبرو ئارامییان نامێنێت، گەورەترین تۆێشووی بانگخوازی پەیامداری کاریگەر، ئارامگرتنە؛ تا خەڵکانی دیکە چاویان لێ بکەن، مێژوو دەوڵەمەندە لە گێڕانەوەی مرۆڤی بەتواناو ئارامگرەکان؛ تا توانیویانە شۆڕشی گەورەو گۆڕانکاری ڕیشەیی‌و بەرچاو بخوڵقێنن.

پێغەمبەری ئیسلام «ﷺ» تێکۆشانو ئارامگرتنەکەی، لەسەر هەموو ئەو نارەحەتییانەی کە بەسەری هاتووە لە ڕووی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رامیارییەوە، بەڵام یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی، متمانە بە خودای گەورەو پەیامو ئارامگرتنی بووە، ئەگەر شوێنکەوتووانی پابەندی ئامۆژگارییە زێڕینەکانی بن، دەبن بە کاریگەرترین مرۆڤ لەسەر زەویداو کاریگەری لەوانی دیکەش دەکەن.

درووستکردنی کاریگەری لەسەر بەرامبەرو کەسانی دی، شێوازی زۆر بەکار هێنراوەو تاقی کراوەتەوە لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤدا، هەندێکیان شوێنەواری ئیجابیانەی بەجێ هێشتووە، هەندێکی دیکەیان لەگەڵ بنەما زانستی‌و دەروونییەکانی مرۆڤ یەکیان نەگرتووەتەوە، چەند تەکنیکێك هەن، مرۆڤی پەیامدار دەکرێت لەژیانی ڕۆژانەیداو لە میانەی مامەڵەکردنی لەگەڵ کۆمەڵگای دەوروبەری بەکاریان بهێنێت، پاشان ئیجابیانە کاریگەری لەسەریان دەبێت‌و متمانەو خۆشەویستییان بەدەست دەهێنێت. یەك لەو تەکنیکە سەرکەوتووانەی کە نووسەری بەناوبانگی ئەمریکی «دیل کارنگی **dale carnegie**» ئاماژەی پێ کردووەو ماوەی ٣٠ ساڵ لەژێر لێکۆڵینەوەو ئەزموونی دەروونیدا بووە، دواجار بە سەرکەوتووترین شێوازی مامەڵەکردن‌و کاریگەری لەسەر کەسانی دی هەژمار کراوەو لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا «چۆن هاوڕێیان بەدەست دێنیت‌و کار لە خەڵك دەکەیت» ئاماژەی بە چەند خاڵ کردووە.

بەڵام ئەوەی جێگای وەبیرهێنانەوەیە، ئەم زانا بەناوبانگە، لە سەدەی بیستدا ئەم لێکۆڵینەوە نوێیەی ئاشکرا کردووەو مرۆڤایەتی لێ تێگەیاند، بەڵام قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر «ﷺ» چواردە سەدە پێش ئێستا، ئاماژەی بەو خاڵە گرنگ‌و جەوهەریانە کردووە بۆ کەسی باوەڕدارو پەیامدار.

لێرەدا هەنگاوەکانی «دیل کارنگی» بەکورتی‌و هەنگاوە گرنگەکانی قورئانیش سەبارەت بە کارتێکردن دەخەینە ڕوو:

١. دوورکەوتنەوە لە مشتومڕ (الجدل):

باشترین ڕێگای بەدەستهێنانی ئەوانی دی، کارلێکردنیان ئەوەیە کە لە مشتومڕ دوور بکەویتەوە، هێندەی دەکرێت هەوڵی پوختکردنەوەی وتەکەت بدەیت؛ چونکە مشتومڕ، متمانەی ئەوانی دیکە بە تۆ کەم دەکاتەوەو هێزی کاریگەریت لاواز دەبێت.

قورئان پێش چواردە سەدە ئەم شێوازەی باس کردووە کە دەفەرموێت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾النحل: ١٢٥

واتە: ئەی پێغەمبەر «ﷺ» بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامەو ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت‌و دانایی‌و ئامۆژگاری جوان‌وبەجێ‌و گفتوگۆ بە جوانترین شێوە.

دوورکەوتنەوە لە (الجدل)، یەکێکە لە هۆکارە سەرکەوتووەکان لەلای مرۆڤی خاوەن پەیام بۆ گەیاندنی ئامانج‌و پەیامەکەی بە خەڵکانی دەورووبەری‌و ببێت بە سەرچاوەی کارکردن لە هاوڕێ‌و دۆستانی.

٢. دوورکەوتنەوە لە تووڕەیی‌و هەڵچوون:

دیل کارنگی دەڵێت: پێویستە چارەسەری کێشەکان لەسەر بنەمای میهرەبانی‌و نەرمونیانی‌و حیکمەت بێت، هەوڵ بدە لە هەڵچوون‌و تووڕەبوون‌و ڕارایی دوور بکەویتەوە؛ چونکە هەڵچوون شوێنەواری نەرێنی لەلای بەرامبەرەکانت بەجێ دەهێڵێت‌و بیرۆکەی هەڵە لەبارەی کەسێتییەوە وەردەگرن.

گومانی تێدا نییە ئارامگرتن‌و ڕق‌و کینەو خۆخواردنەوە ﴿ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ ﴾آل عمران: ١٣٤
نهێنی سەرکەوتنی پەیامی موسوڵمانان بووە، تاوەکو ئەمڕۆش.

ئەگەر بتەوێ کاریگەری درووست بکەیت لەبری تووڕەبوون‌و هەڵچوون بەرانبەر هاوڕێکانت، ئەم هەنگاوانە پیادە بکە:

أ. گرنگی بە هاوڕێکانت بدەو ببە بە چاودێری بەرژەوەندییەکان‌و متمانەت پێیان هەبێت‌و ڕێزو خۆشەویستی‌و گرنگیپێدانی خۆتیان بۆ دەربخە.

ب. دەستەواژەی جوان‌و پاك‌و پڕمانا هەڵبژێرەو لەگەڵ هاوڕێکانتدا گفتوگۆی پێ بکە.

پ. لەبری تووڕەبوون‌و هەڵچوون لە کاتی گفتوگۆی هاوڕێکانتدا، جوان سەرنج بدە لە قسەو وتەکانیان‌و بەدڵ گوێی بۆ بگرەو سەیری ئەملاو ئەولای خۆت مەکە، زانایانی دەروونناسی دەریان خستووە، ئەگەر قسەکەر، گوێگری باشی هەبوو هەست بە ئارامی دەکات‌و سەرسام دەبێت پێی.

ت. ڕەچاوی باری دەروونی‌و هەست‌و گرفتی ڕۆژانەی هاوڕێکەت بکەو تەنها حیساب بۆ بوونی خۆت مەکەو حەزو خولیاو بۆچوونی هاوڕێکانیشت پشت گوێ نەخەیت.

ج. بۆئەوەی بتوانیت کاریگەری درووست بکەیت لەسەر هاوڕێکانت؛ ئەوا پاڵنەرە دەروونییەکانیان بجووڵێنە ئەویش بە گرنگیدان بە بوونی‌و ڕاو پێشنیارو بۆچوونەکانیان؛ تا هەست بە ئارامیی دەروونی بکەن‌و نرخ‌و بەهای خۆیان بۆ دەربکەوێت‌و تۆش ببیت بە سەرچاوەی کارتێککردنی.

کەواتە: مرۆڤ پێویستە هەوڵ بدات، هەڵچوونەکانی بشارێتەوەو ڕێیان پێ نەدات، بە ڕووی ئەوانی دیکەدا بتەقێتەوە، ئەم ڕێسایە، مرۆڤ فێری ڕێکسازیی خود دەکات.

# لە کرێکارییەوە بۆ مامۆستای زانکۆ...!



کـــاروان مستەفا... خوێندکاری دکتۆرا/ مالیزیا

«ڕەحیم»لە ساڵی ١٩٨٧ لەیەکێك لە گوندەکانی سەربەناوچەی (ئیپۆ)ی مالیزیا لەدایك بووە، گوندێك بێبەش لە هەموو مافێکی سەرەتاییو خزمەتگوزاری، دانیشتوانەکەی زۆربەی کاتەکان بێکارەبا بوونو بۆ دەستکەوتنی ئاویش دەبوو لە دووری چەند کیلۆمەترێکەوە بیانهێنایە، سەرەڕای نەبوونی هۆکارەکانی گواستنەوە، تەواوی خانووەکانی ئەو گوندە، لە داروپەردوو درووست کراوەو ئاوەڕۆیەکی نەگونجاویان هەبووە، ئەو خانووەی ڕەحیم تێیدا ژیاوە، لە تەنەکە درووست کراوەو لە دوو ژوورو چێشتخانەیەك پێکهاتووە، تەوالێتو گەرماوێکیش لە دەرەوەی خانووەکە هەبوو، ئەو لە باسی ژیانیدا دەڵێت: باوکم لە کارگەیەکی ستیلدا، کاری دەکردو دایکیشم ژنیماڵەوە بوو، ئەوان هەمیشە هانییان دەدام؛ بۆئەوەی خوێندن تەواو بکەمو ژیانمان لەو کوێرەوەرییە ڕزگاری ببێت، باوکم بۆئەوەی ئاوی خواردنمان بۆ پەیدا بکات، چەند کیلۆمەترێکی دەبڕی، هەندێجاریش دەستی نەدەکەوت، دەبوایە بچوایەتە دەرەوەی گوندەکە، دەریاچەیەکی بچووکی تێدابوو، تەنانەت زۆرجار دانیشتوانی گوندەکەش لەوێ جلو بەرگو خۆشیان دەشوشت، هەروەها دەڵێت: زۆربەی کات کارەبای پێویستمان نەبوو، لەبەرئەوە ناچاربووم بە ڕۆژ هەموو ئەرکەکانی قوتابخانەم تەواو بکردایە، یان پاتری ئۆتۆمبیلمان بەکاردەهێنا بۆئەوەی شەوان بڕێکی کەم کارەبا دەست بخەین، سەرەڕای ئەوەش، هەمیشە چالاکیم هەبوو، زۆریش هەوڵم دەدا، زۆربەی کات لەلایەن مامۆستاکانمەوە، دەستخۆشیو سوپاسگوزاریم پێدەگەیشت، ئەوەش هاندانێکی گەورە بوو؛ بۆئەوەی بەردەوام بەو کۆڵ نەدەم لە خوێندنو بەدەستهێنانی پلەیەکی باشو خەونەکەم بەدی بهێنم، باوکم جلو بەرگو خواردنی بۆ پەیدا دەکردینو هەرگیز نەیدەهێشت لە خوێندن دوا بکەوین، دایکیشم هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم، هەرچۆنێك بێت، دەبێت خوێندن تەواو بکەم؛ بۆئەوەی بتوانم یارمەتییان بدەمو لەو ژیانە سەختە ڕزگاریان بکەم، هەر لە شەش ساڵییەوە لەباخچەی ساوایانی حکوومی ناوی خۆی تۆمار کردبوو؛ بەهۆی ئەوەی بێبەرامبەر بوو، یان بڕە پارەیەکی کەمیان وەردەگرت، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە وتی: دەبوو یارمەتیی دایکیشم بدەم لە ئیشکردنی لە گوندەکەدا، ماندووبوونی دایکمو باوکمو هاندانەکانیان، هۆکاری پشت سەرکەوتنەکانم بوون، هەرچەندە ڕەحیمو خوشکو براکانی وەك منداڵانی دیکە، ڕەفتاریان نەکردووەو داواکاری بۆ جلی جوانو کڕینی یاریی منداڵان، یان داوای گەڕانو چوونە دەرەوەیان نەبووە؛ بەهۆی نالەباری ژیانیانەوە، برا گەورەکەی خوێندکارێکی زۆر زیرەك بووەو لەسەر ئاستی خوێندنگاکەی پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە، بەڵام هەست بەوە دەکات بۆ یارمەتیدانی خێزانەکەی، پێویستە کار بکات واز لە خوێندن دەهێنێت، بۆیە ئەو دەڵێت: دوای دایكو باوکی، برا گەورەکەی، هۆکاری سەرکەوتنیەتی لە ژیانیدا.

ڕەحیم دەڵێت: هێندە خولیام بوو لە داهاتوودا ببم بە پزیشك، زۆربەی کات لەسەر کاغەزی تاقیکردنەوە لە پێش ناوەکەی خۆم دەمنووسی «دکتۆر»، بە پێکەنینەوە باسی لەوە کرد، باوکی جۆرە نەخۆشییەکی پێست لە پێیەکانیدا هەبووە، ئەم جۆرە پاودەرێكو هەندێك ماددەی دی تێکەڵ کردووەو داویەتی لە پێیەکانی باوکی، دەڵێت: بڕوا دەکەن، یان نا.. باوکم پاش چەند مانگێك پێیەکانی زۆر باشتر بووبوو، هەرچەندە ئەو ئەوە نازانێت دووبەختی بووە، یان دەرمانەکانی ئەو بەسوود بوون.

هەرچەندە هەموو خەونی ئەوە بوو، ببێت بە پزیشك، بەڵام لە قۆناغی ئامادەییدا، نمرەکەی بۆ بوون بە پزیشك نەدەبوو، بە ناچاری لە بواری زانستی تاواندا، لە زانکۆی (یو ئێس ئێم) دەخوێنێتو لە ساڵی ٢٠١١ بەکالۆریۆس لەوبوارەدا بەدەست دەهێنێت، لە زانکۆی ناوبراودا وەك باشترین خوێندکار دەستنیشان دەکرێت، بۆیە دوو خەڵاتی زێڕینی لەلایەن سەرۆکایەتیی زانکۆوە پێ دەبەخشرێت، بێئەوەی پلەی ماستەر بخوێنێت هەمان زانکۆ کورسی خوێندنی دکتۆرا لە بواری تاواندا بۆ ڕەحیمی هەژار دابین دەکاتو لە کۆتایی ٢٠١٤ بەسەرکەوتوویی تەواوی دەکات، توێژینەوەی دکتۆراکەشی بە باشترین توێژینەوەی ئەو ساڵە دەستنیشان کرا، شایانی باسە ئێستە ڕەحیم ٢٨ ساڵەو یەکێکە لە دکتۆرە دیارەکانو مامۆستای زانکۆیە لە یەکێك لە زانکۆ حکومییەکانی مالیزیاو خەریکی وانەوتنەوەو ئەنجامدانی توێژینەوەی زیاترە لە بوارەکەی خۆیدا؛ بۆئەوەی یارمەتیی گەلو نیشتمانەکەی بدات.

لە ئێستادا، زۆربەی ڕۆژنامەکانی مالیزیا چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکەنو توێژینەوەکەی زۆر بەرز دەنرخێنن، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، حکومەتی وڵاتەکەی داوای توێژینەوەی ئەو گەنجەی کردووە؛ بۆئەوەی لە بواری تاوانو کەمکردنەوەی ڕێژەی تاواندا، سوودی لێوەربگرێت، مالیزیا بەو جۆرە کار دەکات، بۆیە لە پێشکەوتنی بەردەوامدایە.

زۆرجار وا ڕێك دەکەوێت، هەژارەکانو تەنانەت نەوەی پێشمەرگەکانیش، لە ژیانیاندا، چیرۆکی سەرکەوتنی گەورە تۆمار بکەن. ئەمەش پێمان دەڵێت: هەرگیز هەژاری، نابێت بە ڕێگر لەبەردەم بەدیهاتنی خەونەکانماندا، تا بتوانین لەڕێگەی پەروەردەوە وڵات بەرەو پێش بەرین، هەروەك چۆن ماندێلای سەرکردە دەڵێت: «پەروەردە کاریگەرترین چەکە، بۆ گۆڕینی جیهان!»



# ئایا کاتی نەهاتووە؟

ئا: ئازاد محەممەد بەرگرکەی

کاتــی نەهاتــووە، واز لە گوفتــار بهێنین؟ دەســت بە کردار بکەین، زۆرمان گوت، زۆرمان گوێ گرت، قســەی زۆرمان بیســت، بــەڵام نەماندیــت ببێت بە کردار، قســە زۆرە، دانیشــتن‌و کۆڕو سمینارو مێزگرد زۆرن، بەڵام پاڵەوانی مەیدانی پراکتیک‌و کردار کەمن، وەستای قسانین‌و کۆڵەواری دەستانین، کوردیش زۆرجوانی وتوە: (پشیلەیەك زۆر بمیاوێنێت، کەم ڕاو دەکات)!

کاتــی نەهاتــووە واز لــە ڕواڵــەت بهێنین‌و ئاوڕێــك لەناخ بدەینــەوە؟ خۆزگە هێندەی مامەڵە لەگەڵ ڕواڵەتو ڕووکەشــدا دەکەیــن‌و بڕیــاری لەســەر دەدەین، نیــو هێندە بــەلای ناخدا چووبایــن، ناخ پێوەر بوایە، کارکردن پێوەر بوایە، نەوەك شــتی دی. بەدیعوزەمان ســەعید نوورسی دەڵێت: (ئەوەی کاکڵی دەست نەکەوێت، بە توێکڵەکەوە سەرقاڵ دەبێت)!

کاتی نەهاتووە بەرگی مرۆڤایەتی، بە بەر مرۆڤدا بکرێتەوە؟ ئەو ڕێزو مافو ئازادییەی خودا پێی بەخشــیوە، پێی بدرێتەوە؟ خــودای پــەروەردگار مرۆڤــی تەکریم کــردووە، ڕێــزی لێناوە کردوویەتــی بە جێنشــینی خۆی لەســەر زەوی، هەڵی بژاردووە. بە سەر باقی بوونەوەرانی دی، کەچی بەداخەوە، ئیمڕۆ هەرچی بایــەخ‌و ڕێــزو قــەدرو نرخێکی نەبێــت، خوێنــی مرۆڤەکانەو مرۆڤدۆستی لە فەیرانێکی قووڵدایە، کاتێك ئەو هەموو ڕێکخراوە ناوخۆیی‌و جیهانیانە کــە لافوگەزافی مرۆڤایەتی‌و مافی مرۆڤــو ئازادی لێ دەدەن، بەڵام تەنها موزایەدەیە، فریودانە، خەڵەتاندنە، هەموو قســەی زلی زەبەلاحی بریقــەدارن، ئەگینا بۆچی نایەنە سەر خەتو بەجددی هەوڵی بۆ بدەن‌و هەڵوێستی ناوازە بنوێنن.

کاتی نەهاتووە دڵســۆزی بکەین بــە هەوێنی کارەکانمان‌و واز لە ڕیاو ڕووبینی بهێنین؟ واز لە خۆنمایشــکردن بەســەر یەکەوە بهێنین؟ بەدڵســۆزی‌و خەمخۆرانە، کارەکانمان جێبەجێ بکەین‌و لە پێناوی خودادا، کار بۆ خەڵك بکەین؟

ئایا کاتی نەهاتووە، خوێندنەوە بکەین بە بەشــێك لە ئیشی ڕۆژانەمان‌و سنوورێك بۆ تەکنەلۆژیا دابنێین؟ چونکە خوێندنەوە زامنی ســەرکەوتنە، خوێندنەوە مرۆڤ دەکات بە شۆڕشگێڕ، هەر بەڕاستی خەریکە دەبین بە ئامێر لە بەردەستی ئامێر، دەبین بە کەرەستە لە بەردەستی کەرەستە، دەبین بە بەندەی فەیسبووك‌و شتی لاوەکی‌و مالایەعنی، کە زەنگێکی مەترسیدارە. ئەگەر ژیرانە بێدار نەبینەوە؛ ئەوا لەناو خەوی بێئاگاییدا دەتلێینەوە.

کاتــی نەهاتووە واز لەیەکدی تەکفیرکردن‌و پۆلێنکردنی یەکدی بۆ بەهەشتو جەهەنەم، باش‌و خراپ بهێنین؟ بە هەموومان خزمەتی ئــەم پەیامــە بکەین، تەبشــیری مەســیحیەتو .....تــاد، بە هەموو شــێوەیەك، ئیش لە ســەر ئــەوە دەکەن، ئێمــە لاواز بکەن، ئێمەش ئەوانمــان لەبیــر چووەتەوە؛ لەبەر دژایەتیی یەکــدی، ئێمە خوداو پێغەمبەرو قیبلەو قورئانمان یەکە، ئیدی چیمان داوە لە شتە جزئی‌و لاوەکییەکان، ئەگەر ڕاست دەکەین، با واز لە یەکدی بهێنین‌و ڕوو لە پلانەکانی دوژمن بکەین‌و هەڵیان بوەشــێنین، شکستیان پێ بهێنین.

کاتــی نەهاتووە خۆمــان خاوەنی پێگەو کەســێتی، بیرۆکەو کەلتوورو کەلەپوورو دەســتکەوتی خۆمــان بین، واز لە تەقلیدی کوێرانــە بهێنیــن، چیــدی سەرســامی خۆمــان بۆ کەســێتییە غەریبەکان دەرنەبڕین، ئێمە خاوەنی گەورەترین کەســێتی سەر ڕوی زەمینیــن ئەویــش پەیامبەر ڕوح الأمیــن محمد المصطفی «ﷺ»ە، ئێمــە با فەیلەســوف لە ناوخۆ درووســت بکەین، نەك هاوردەی بکەین.

کاتــی نەهاتووە ســنوورێك بۆ ڕاگەیاندنــەکان دابنرێت، کە چیدی هەواڵی نادرووســت بڵاو نەکەنــەوە، درامای وەها پەخش نەکەن، کە ڕەوشتی مرۆڤ ناهێڵێت، شیرازەی خێزان، لەبەریەك هەڵدەوەشێنێتو خەڵك تووشی بێڕەحمی‌و بێویژدانی دەکات.

کاتــی نە هاتــووە کە بڵاوکــراوەکان، لە ململانێی سیاســی‌و حزبی بهێنرێنــە دەرەوە، بخرێنە قاڵبێکی ئەکادیمی بۆ زاخاوی مێشك‌و ژیری‌و هزریی خەڵك؟!

کاتــی نەهاتــووە کە ســنوورێك‌و سانســۆرێك بۆ بــازاڕەکان دابنرێــت، کــە چیدی شــتی خراپ هــاوردە نەکــەن، هەر یەك بەنرخێکی جیاواز بە کەیفی خۆی شمەك‌و کاڵاو باڵا نەفرۆشێتو شتی ماوە بەسەرچوو دەرخواردی خەڵك نەدرێت؟!

# پێشەوا عەبدولعەزیز بن باز

## ٢٢ نوفمبر ١٩١٠ - ١٣مایو ١٩٩٩



پێشەواو عەلامەو زانای بەناوبانگی سەردەمو کەسێتیی دەگمەنی زەمان (شێخ عەبدولعەزیز بن باز)، موفتی بەناوبانگی وڵاتی سعوودییەو یەکێك لە زانا پایەبەرزو ناسراوەکانی سەدەی بیستە، پێشەوا ڕاوبۆچوونەکانی بەڵگەیەکی بەهێزو یەکلاکەرەوەن، کەسێکی زمانپاراوو ڕەوانبێژ، لە مامەڵەدا کەسێکی نەرمونیانو لەسەرخۆ بوو، هەرگیز لە لۆمەی لۆمەکارانو گلەیی گازندەکاران نەدەترسا، ژیانی ئەو زانا پایەبەرزە، سوودو قازانجی زۆری بۆ جیهانی ئیسلامی هەبوو، هاوکات کۆچی دوایی زانای پایەبەرز، خەسارەتێکی گەورە بوو بۆ موسوڵمانانی جیهان بەگشتیو موسوڵمانانی نەجدو حیجاز بەتایبەتی، زانای پایەبەرز، پێش ئەوەی زاناو موفتییەکی لێهاتوو بێت، باوكو پەروەردەکارێکی لێهاتوو بوو بۆ موسوڵمانان.

### (شێخ عەبدولعەزیز بن باز) کێیە؟

(شێخ عبدالعزیز بن باز) لە ١٩١٠/١/٢٢ لە شاری ڕیاز لەدایك بووە، هەر لە تەمەنی منداڵیدا، باوکی کۆچیی دوایی دەکاتو ئیدی بن باز دوور لە سۆزو ئامێزی باوکی، لەگەڵ دایکیدا ژیان دەگوزەرێنێت، خێزانەکەی حەزیان دەکرد بن باز سەرقاڵی کاری بازرگانی بێت؛ بۆئەوەی بتوانێت بژێوی ژیانیان بۆ دابین بکات، بەڵام بن باز فەزڵی عیلمو زانستو خوێندنی بەسەرماڵو ساماندا داو خۆی تەرخان کرد بۆ فێربوونی زانستو زانیاری، ئیدی بەردەوام بوو لە گەڕان بە دوای زانستو زانیاریدا لەسەر دەستی زانایانی شاری ڕیاز. بن باز سەرەتا هیچ کێشەیەکی تەندرووستیو کەمئەندامی نەبووە، دواتر لە تەمەنی شانزە ساڵیدا، چاوەکانی کز بوون، پاشان لە تەمەنی بیست ساڵیدا بۆ هەمیشە چاوەکانی لە دەست داو بوو بە کەسێکی نابینا، بەڵام نابینایییەکەی نەبووە ڕێگر لەبەردەم فێربوونی زانستو زانیاریو گەڕان بەدوای زانستدا، پێش تەمەنی پێگەیشتن، هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە.

شێخ زانستی لەسەر دەستی زۆرێك لە زانایانی سەردەمی خۆی خوێندووە.. شێخ بن باز، بەزوویی زانستە شەرعییەکانو زانستی زمان فێربوو، پاشان لە ساڵی ١٣٥٧ کۆچی، واتە: لە تەمەنی بیستو حەوت ساڵیدا بوو بە قازی، شێخ بەردەوام زانستخواز بوو، تەنانەت بۆ ڕۆژێکیش دانەبڕا، تا ئەو ساتەی ماڵاوایی لە ژیان کرد، لەگەڵ ئەوەشدا، شەوو ڕۆژی خستبووە سەر یەك؛ بۆ وانەوتنەوەو توێژینەوەی زانستی، مامۆستای پایەبەرز، جگە لە زانستو زانیاری بە هیچ کارێکی دیکەوە خۆی سەرقاڵ نەکردووە، لە نێو زانستەکانیشدا گرنگییەکی زۆری بە زانستی فەرموودە داوە، تا بووە بە کەسێکی متمانەپێکراو لە هەڵبژاردنی فەرموودەداو توانیویەتی فەرموودەی لاوازو درووست، لێك جیا بکاتەوە، لەو بوارەشەدا، گەیشتووە بە ئاستێك، کە کەم کەس توانیویانە بگەن بەو ئاستە، بەتایبەت لەم سەردەمەدا، دانایيو شارەزایی لە زانستی فەرموودەدا، شوێنەواری لەسەر نووسینو فەتواکانی جێهێشتوە، بەشێوەیەك سەرجەم قسەکانی، بە پاڵپشتی فەرموودە کردووە، لە هەمان کاتدا شێخ بن باز بە کەسێکی نەرمونیانو هێمنو لەسەرخۆ وەسف کراوە، هەروەها کەسێکی ئازاو بوێر بووە، لە ئاشکراکردنی حەقو ڕاستیدا، لە هەمان کاتدا کەسێکی بەویقارو بەشەرمو سینەفراوان بووەو هەمیشە گوێی بۆ بەرامبەر ڕادێراوە!

### شێخ بن باز بووە بە قازی شاری الخرج:-

* لەو کاتەی شێخ بن باز تەکلیف کرا ببێت بە قازی لە شاری (الخرج) ساڵی ١٣٥٧، حەزی بەو کارە نەدەکرد، بەناچاری ڕازی بوو؛ چونکە شێخ محمد بن ابراهیم ئیلزامی کرد، کە ئەو پۆستە وەربگرێت، ئەو کاتەی گەیشت بە شارەکە، چووە ناو مزگەوتی گەورەی شارەکەو دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان چووە لای ئەمیری شارەکەو لەگەڵ خەڵکی شار کۆبووەوەو وتارێکی کاریگەرو بەپێزی پێشکەشکردن، لە وتارەکەیدا، جەختی کردەوە کە حەز بە قەزاوات ناکاتو سوێندی بۆ خواردن کە هیچ خۆشی لە کاری قەزاوات نایەت، بەڵام ئیلزام کراوم

که ئەم پۆستە وەربگرم، شێخ بن باز چواردە ساڵ وەکو قازیو مامۆستا لەو شارەدا مایەوە، ڕۆژانە لە چێشتەنگاو تا نیوەڕۆ کاری قەزاواتی دەکردو هەندێجاریش تا عەصر، پاشانیش سەرقاڵی وانەوتنەوەو وتاردان دەبوو، چەندین فێرخوازی ناوەو دەرەوەی وڵات لەسەر دەستی شێخ بن باز زانستی شەرعییان دەخوێند، ژمارەی فێرخوازەکانی هێندە زۆربوون، کە جێگەیان نەدەبوو لە مزگەوتەکەیدا، لەبەرئەوە داوای لە پاشای سعوودییە کرد کە باڵەخانەیەك بۆ شوێنی نیشتەجێبوون بۆ فێرخوازەکانی درووست بکات، ئەویش پێشنیارەکەی پەسەند کردو باڵەخانەیەکی بۆ درووست کردن، بەڵام لەبەرئەوەی ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەی فێرخوازەکان لە زیادبووندا بوون، باڵەخانەکەش بەشی نەکردن، ناچار شێخ بن باز، چەند خانوویەکی لە نزیك باڵەخانەو مزگەوتەکە بۆ فێرخوازەکانی بەکرێ گرت.. بەکورتی زانای پایەبەرز، جگە لە کاری قەزاوات لەو ماوەیەدا، سەرقاڵی ئەم کارانەش بوو:

* پێشنوێژو وتاربێژی مزگەوتی گەورەی شارەکە.
* گرنگیدان بە فەرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپە.
* فەتوای شەرعی لەسەر ئاستی شارو وڵات.
* بەڕێوەبردنی کاروباری مارەکردنو پڕۆسەی هاوسەرگیری.
* دابەشکردنی میراتیو جێبەجێکردنی ڕاسپاردەو دەسەڵات لە کۆشکدا.

پاش پشوودانێکی کورت، لە هەمان کاتدا وانەی دەوتەوەو حەڵقەکانی وانەوتنەوەکەی ڕۆژانە، تا درەنگانێك بەردەوام بوو، جگە لە ڕۆژانی سێ شەممەو هەینی..

لە ساڵی ١٣٧٢ گوێزرایەوە بۆ ڕیاز بۆ وانەوتنەوە لە پەیمانگەی زانستیی ڕیازو ئەو ساڵە لەو پەیمانگایە وانەی وتەوە، پاشان کاتێك لە ساڵی ١٣٧٣ کۆلێژی شەریعە دامەزرا، گوێزرایەوە بۆ کۆلێژی شەریعەو لەوێ وانەکانی فقهـ و زانستی فەرموودەو یەکتاپەرستی دەوتەوە. هاوکات حەڵقەی وانەوتنەوەی مزگەوتی گەورەی شاری ڕیازی دامەزراند.

دواتریش لە ساڵی ١٣٨١ بووە بە جێگری سەرۆکی زانکۆی ئیسلامی لە مەدینەی پیرۆز، لەو کاتەش کە لە مەدینەی پیرۆز بوو، زۆرێك خوێندکاری لەو شارە هەبوو، کە وانەو زانستە شەرعییەکانی پێدەگوتن، هەروەها لە ساڵی ١٣٩٠ بووە بە سەرۆکی زانکۆی مەدینەی پیرۆز، تا ساڵی ١٣٩٥، لەگەڵ ئەوەشدا حەڵقەی تەدریسی لە مزگەوتی نەبەوی هەبووە.

## پۆستەکانی شێخ بن باز:

١- لە ١٤/ شوال/١٣٩٥ پادشا خالید بن عەبدولعەزیز، فەرمانێکی شاهانەی دەرکرد، بە دامەزراندنو دیاریکردنی شێخ بن باز، وەکو سەرۆکی گشتی بۆ بەڕێوەبردنی توێژینەوەی زانستیو فەتواو بانگەوازو ڕێنمایی، بە پلەی وەزیر.

٢- لە مانگی محرم ساڵی ١٤١٤ فەرمانێکی دیکەی شاهانەی بۆ دەرچوو، لەلایەن شا (فەهد بن عەبدولعەزیز)، بە درووستکردنی وەزارەتێك تایبەت بە کاروباری ئیسلامیو بانگەوازو ڕێنماییو ئەوقاف، واتە: شێخ بن باز کرا بە وەزیری ئەوقافو کاروباری ئیسلامی.

٣- پاشان لە فەرمانێکی دیکەی شاهانەدا، شێخ بن باز کرا بە موفتی وڵاتی سعوودیەو سەرۆکی گەورەزانایانی وڵاتەکەی.

٤- بووە بە سەرۆکی توێژینەوەی زانستیو فەتوا بە پلەی وەزیر، لەم پۆستەیدا مایەوە، تا ئەو ساتەی گەڕایەوە بۆ لای خودای گەورەو بۆ هەمیشە ماڵاوایی کرد.

شێخ بن باز بە مامۆستاو زانای زانستی فەرموودە ناسرابوو، یەکێك بوو لە عەلامەکانی سەدەی بیستەم، فەتواو موحازەراتەکانو وانەکانی بەنووسراویو بەشێوەی دەنگی، بە پەخشی ڕاستەوخۆو تا ئەم ساتەش، وەکو میراتێك بۆ موسوڵمانان ماوەتەوەو لە ڕێگەی بەرنامەی بەناوبانگی (نور علی الدرب) پەخش دەکرێت، لە ڕێگەی ئیزگەی قورئانی پیرۆزەوە لە وڵاتی سعوودیە.

هەروەها شێخ بن باز، بڕیاری دانانی پڕۆگرامێکی دا، کە لەم سەردەمەداو لە جیهانی ئیسلامیدا ناسراو نییە، ئەویش فەتوا پاڵپشت بە قورئانی پیرۆزو فەرموودە، دەرکردنی فەتوا بەبەڵگەی قورئانیو فەرموودە صەحیحەکان..

لە کاتێکدا زۆرێك لە موفتییەکان لە فەتوادا، پشت بە زانایانی مەزهەبەکان دەبەستن..

ئەو پۆستانەی مامۆستای پایەبەرز شێخ بن باز بەڕێوەی بردووە:

١- سەرۆكو ئەندامی ئەنجوومەنی دامەزرێنەری ڕابیتەی جیهانی ئیسلامی.

٢- سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای جیهانی بۆ کاروباری مزگەوتەکان.

٣- سەرۆکی (المجمع الفقهي) ئیسلامی لە مەککەی پیرۆز.

٤- ئەندامی ئەنجوومەنی باڵا لە زانکۆی ئیسلامی لە مەدینەی پیرۆز.

٥- ئەندامی دەستەی باڵا بۆ بانگەوازی ئیسلامی.

شێخ بن باز، لە ساڵی ١٤٠٢ بۆ خزمەتی ئیسلام خەڵاتی جیهانی مەلیك فەیسەڵی پێ بەخشراوە، شێخ بن باز ئەم خەڵاتەی فرۆشتو پارەکەی بەخشی بە خانەی فەرموودە، وەکو هاوکاری بۆ زانستخوازانی فەرموودەو چاودێریکردنیان، ئەمەش گرنگی پێدانی شێخ بن باز، دەگەیەنێت بە فەرموودەکانی پێغەمبەری ئازیز «ﷺ»

لەبارەی شێخ بن بازەوە، شێخ ئەحمەد یاسین دەڵێت: شێخ بن باز عەلامەو مەرجەعی ئیسلامییە لەسەر ئاستی جیهان، ئەو بەدرێژایی ژیانی، لە بەرگریدا بووە لە ئیسلامو موسوڵمانان، زانای پایەبەرز خاوەن زانستێکی گەورەو ناوازە بووەو بەردەوام دەستی بە ڕێبازی پێشینی ئەم ئوممەتەوە گرتووەو لەسەر مەنهەجی قورئانو سوننەت، بانگەوازی بۆ ئیسلام کردووە.

شێخ ئەحمەد لە کۆتاییدا دەڵێت: شێخ بن باز، زانایەکە کە جێپەنجەی بەڕوونی لەم سەردەمەدا دیارە.

**دانراوەکانی شێخ بن باز:** شێخ بن باز، زیاتر لە بیستو پێنج کتێبو شەستو یەك نامیلکەی داناوە، کە سەرجەمیان بە چاپ گەیەنراون، جگە لە دانانی ئەو ژمارە زۆرە، لە کتێبی بەسوودو نامیلکانە، تەعلیقی لەسەر ئەم کتێبانەش نووسیوە: (بلوغ المرام، تقريب التهذيب للحافظ ابن حجر، (التحفة الكريمة فى بيان كثير من الأحاديث الموضوعة والسقيمة، تحفة أهل العلم والإيمان بمختارات من الاحاديث الصحيحة والحسانو چەندانی دیکە).

## کۆچی دواییو ماڵاوایی هەمیشەیی شێخ عەبدولعەزیز بن باز:

شێخ بن باز لە ڕۆژی پێنج شەممە ٢٧/محرم/١٤٢٠ لە تەمەنی ٩٠ ساڵیدا، گەڕایەوە بۆ ڕەحمەتی پەروەردگارو بەیەکجاری ماڵاوایی لە ژیانو موسوڵمانان کرد، جەنابی شێخ لە ٢٨ محرم لە حەرەمی مەککەی پیرۆز نوێژی لەسەر کراو لە زۆربەی زۆری مزگەوتەکانی وڵاتی سعوودیەو زۆرێك لە وڵاتانی ئیسلامی نوێژی غائیبیان لەسەر کرد، پاشان لە گۆڕستانی (العدل) لەشاری مەککەی پیرۆز بە خاك سپێردرا.

بەرزان ئەبوبەکر



جەلال عەبدوڵڵا حاجی

بەشی دووەم

ژینگە

# خۆری سەوزو شین..!

دووکەڵی تەقینەوە گڕکانییەکانو خۆڵبارین، لە ئەنجامی بای بەهێزەوە، دوو دیاردەی سرووشتین، دەبن بەهۆی گۆڕان لە ژینگەو پیسبوونی، لە بەشی یەکەمدا باسی بەهێزیو کاریگەریی گڕکانی (کراکاتو)مان کرد، کە یەکێکە لە گڕکانە زۆر چالاکەکان. لە نووسینەکانی (جاوا)ی کۆندا هاتووە، لە ساڵی (٤١٦ز)دا تەقینەوەیەکی زۆر گەورە لەو گڕکانەکەدا ڕووی داوە، بووە بەهۆی درووستبوونی سێ دوورگە لە دەوری گڕکانەکە.

دەبێت ئاماژە بەوە بکەین، تەقینەوەی گڕکانی (کراکاتو) لە ساڵی(١٨٨٣ز) گەورەترین تەقینەوەیە، بەوردی لە مێژوودا تۆمار کرابێت، بەڵام تەقینەوەی گڕکانی دوورگەی سانتورین (ناوە کۆنەکەی پیرا)، وا مەزەندە دەکرێت: شەش هێندەو نیو لە تەقینەوەی گڕکانی (کراکاتو) گەورەتر بووە، کەلە کۆمەڵە دوورگەی (ئەرخەبیل)ی یۆنانیدا ڕووی داوە، لە سەدەی پازدەیەمی پێش زایین، تا ئێستاش دەتوانین ئاسەوارەکەی ببینین، زیاترلە نیوەی دوورگەی (سانتورین) لە شوێنەکەی هەڵکێشراوە، هەندێك لە مێژوونووسو زانایان لەبەر ڕۆشنایی ئەم تەقینەوەیەدا، شیکردنەوە بۆ هەندێك لە ڕووداوو ئەفسانە مێژووییەکان دەکەن، لەوانە کۆتایی هاتنی شارستانیەتەکان بەخێرایی، وەك شارستانیەتی (کریت)، یان وشکبوونو نەمانی ئاو لە بەشی سەرەوەی دەریای سوور، بە هۆی شەپۆلە ئاوی بڵندەوە، بەبەرزی (٤٠ مەتر)، وەك ئەوەی لە تەقینەوەکەی (کراکاتو)دا ڕووی دا، هەروەها تەقینەوەی ڤیزوڤ (Vesuvius) لە ساڵی( ٧٩ ز)دا لە ئیتاڵیا، ئەم تەقینەوەیەش، لە (کراکاتو) گەورەتر بوو.

لە سەرچاوە مێژووییەکاندا، ئاماژە بەتەقینەوەیەکی گەورە کراوە، کە لە ساڵی (٥٣٥ز)و ساڵی دواتری ڕووی داوە، ڕەنگە ئەوەش بەهۆی گڕکانی(کراکاتو)ەوە بێت، مێژوونووس پرۆکۆپیوس (Procopius) لەبارەی ئەوساڵەوە دەڵێت: لەماوەی ئەو ساڵەدا، دیاردەی ترسێنەر دەرکەوتن، خۆر ڕووناکی هەبوو، بەڵام بێتین بوو، لە خۆرگیرانی بەردەوام دەچوو؛ چونکە تیشکەکەی ڕوون نەبوو!، بەڵام (جون لیدیس Lydius) دەڵێت: بەدرێژایی ساڵەکە، خۆر بەنزیکەیی دیار نەما، بۆیە میوەکان کاتێك لێکرانەوە، کاتی خۆیان نەبوو!، هەروەها میخائیلی سووری لەبارەی ئەو ساڵەوە دەڵێت: خۆر ڕووناکی لەدەست دا، تاریکی بۆ ماوەی (١٨) مانگ بەردەوام بوو، ڕۆژانە نزیکەی (٤ کاتژمێر) وەدەر دەکەوت، لەگەڵ ئەوەشدا ڕووناکییەکەی زۆر کەم تین بوو، میوەکان پێ نەگەیشتن!

(کاسیۆدورەس Cassiodorus) دەڵێت: خۆر ڕووناکی لەدەست دا، بەڕەنگی مەیلەو شین دەردەکەوت، بەلامانەوە سەیر بوو، سێبەری خۆمان تا کاتی نیوەڕۆ نەدەبینی، دیاردەکە لە خۆرگیران دەچوو، ماوەی ساڵێك درێژەی کێشا، هاوینەکەمان گەرمای نەبوو. بەهۆی بای باکورەوە، دەغڵودان زوقم لێی دابوو، بارانیش نەدەباری!!

لێکۆڵینەوەی زانا (مایك بیلی Baillie) لە زانکۆی بلفاست، کە لەم ساڵانەی دواییدا، لەبارەی ئەو قۆناغەوە بڵاو کرایەوە، لەڕێگەی لێکۆڵینەوە لە ئەڵقەی درەختەوە (ئەو درەختانەی تەمەنیان لە هەزار ساڵ زیاترە)، ڕێگەیەکی باوە بۆ زانینی دیاردە سرووشتییەکانو کاریگەرییان، گەیشت بەوەی ئەڵقەکانی درەخت بۆمان ڕوون دەکەنەوە لە ناوەڕاستی دەیەی چوارەمی سەدەی شەشەمی زایینی (واتە: نزیکەی ٥٣٥ ز) ، دواکەوتنی گەشە ڕووی داوە لە درەختەکاندا بۆ ماوەی (١٥ ساڵ)، ئەمە بەڕوونی دەری دەخات ڕووداوێکی گرنگ ڕووی داوە لەو ماوەیەدا!، هەندێك لە زانایان هەوڵ دەدەن، بڵاوبوونەوەی تاعوون لەسەر ئاستی جیهان لە ساڵی (٥٤٣ز) ببەستنەوە بەم دیاردەیەوە، لەگەڵ جووڵەی جرجەکان لە دوورگەی (مەدەغەشقەر)، لەڕاستیدا ناتوانین ئەوە بزانین ئەو کاتە پلەکانی گەرما چەند دابەزیوە، یان لەکاتی تەقینەوەی دوورگەی سانتورین لە یۆنان، یان گڕکانی ڤیزوڤ لە ئیتاڵیا، وەك ئەوەی ساڵی (١٨٨٣ز) لەکاتی تەقینەوەی (کراکاتو)، ئەوکاتە زانست پێشکەوتبوو، وێستگەی چاودێریی کەشوهەوا زۆر بڵاو بوو، بەتایبەت لە ئەوروپاو ئەمریکاو وڵاتە موستەعمەرەکانیان، گۆڕانکارییەکانی کەشوهەوا بەشێوەیەکی باش تۆمار دەکران.

ئەوەی کە ڕووی داوە، سرووشتی بووەو هیچ دەستی مرۆڤی تێدا نەبووە، کاریگەرییەکەشی دوای چەند ساڵێك نەماوە، پلەکانی گەرما دابەزینی بەخۆوە بینی، بە تێکڕایی نزیکەی (١، ٢) پلە لە پاش تەقینەوەی (کراکاتو)، ئەمەش کاریگەرییەکی زۆرە، ئەو سەردەمە بەرزبوونەوەی پلەی گەرما نەبوو، وەك ئەوەی کە ئێستا ڕوو دەدات بەهۆی کارەکانی مرۆڤەوە، هەتاهەتاییو کوشندەیە، ئەگەر مرۆڤ ڕێوشوێنی خێرا نەگرێتە بەر.

سەرچاوە: کتێبی، حل مشكلة الطاقة – فؤاد قاسم الأمير

# سەرکەوتووەکان بێ قوتابخانە

## مایکڵ دێڵ (١٩٦٥ - .....)

ئالانی

**کەسی گەورە، چاوەڕانی هەلو دەرفەت ناکات، بەڵکو هەلو دەرفەت درووست دەکات! کولتون**

لە بیرۆکەی بچووکەوە، کە لاوێکی بچووک بنیاتی ناوە، ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی بەرپا کرد! دێڵ چۆن بوو بە بچووکترین ملیاردێری جیهان، لە ڕووی تەمەنەوە؟ چۆن بوو بە بچووکترین بەرپرسی جێبەجێکاری سەرۆکەکانی ساڵ، لە لیستی ٥٠٠ کەسەکەی جیهاندا؟

ئەم لاوە چۆن توانی، لە ماوەیەکی کورتدا، خەونو هیواو ئاواتەکانی بەدی بهێنێت!"

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەو ناسینی خودی مایکڵ دێڵ، بەم شێوەیە دەست پێ دەکەین:

مایکڵ دێڵ لە شوباتی ساڵی ١٩٦٥ لە هیوستن لەدایك بووە، باوکی کاری ڕاستکردنەوەی ددانی دەکرد، دایکیشی ئاڵوگۆڕی دراوی دەکرد.

دێڵ هەر لە منداڵییەوە، گرنگییەکی زۆری بە کۆمپیوتەرو چۆنێتیی کارکردنی دەدا، کاتێکیش تەمەنی گەیشتە پانزە ساڵان، بۆ یەکەم جار کۆمپیوتەرێکی لە مارکەی ئەپڵ، پاشان تەواوی ئەو کۆمپیوتەرەی هەڵوەشاند؛ بۆئەوەی بزانێت چۆن کار دەکات!!

دوو ساڵ دوای کڕینی ئەو کۆمپیوتەرە، ماوەی یەك هەفتە لە خوێندنگە غائیب بوو، بۆئەوەی سەبارەت بە کۆمپیوتەر سیمینارێك ئامادە بکات!

دوای تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی، دێڵ پەیوەندیی کرد بە زانکۆی تەکساسەوە، هەر لە ساڵی یەکەمی خوێندنیدا، هاوشانی خوێندنەکەی کاری فرۆشتنی کۆمپیوتەرو پێکهاتەو پارچەکانی کۆمپیوتەری دەکرد، بۆ خوێندکارانی زانکۆکە، بەو هۆیەوە توانی لە کۆتایی ساڵدا ببێت بە خاوەنی شوقەیەکی نیشتەجێبوون.

هیوا بەرزەکانی دێڵ، زۆر لەسەرو زانکۆو بەدەستهێنانی بڕوانامەی زانکۆوە بوو، لەبەرئەوە نەیدەتوانی چاوەڕێ بکات؛ تا خوێندنی زانکۆ تەواو بکات؛ بۆئەوەی کۆمپانیایەکی تایبەت دابمەزرێنێت، لەبەرئەوە لە ساڵی ١٩٨٤ وازی لە خوێندنی زانکۆ هێناو کۆمپانیای (کۆمپیوتەری دێڵ)ی دامەزراند، بە سەرمایەیەك کە نەدەگەیشتە تەنها هەزار دۆلار، ئەم بیرۆکەیەش لە پێش ئەودا، کەس بە خەیاڵیدا نەهاتبوو!

دوای دوو ساڵ لە دامەزراندنی کۆمپانیای دێڵ بۆ کۆمپیوتەر، لە پێشانگای (کومدیکس) کۆمپیوتەرێکی نمایش کرد، کە خێراییەکەی ١٢ میگاهێرتز بوو، نرخەکەی ١٩٩٥ دۆلار بوو، بە بەراورد بە کۆمپیوتەری (ئای بی ئێم) کە خێراییەی تەنها ٦ میگاهێرتز بوو، نرخەکەشی ٣٩٩٥ دۆلار، واتە: کۆمپیوتەرەکەی دێڵ لە ڕووی خێراییەوە، دوو ئەوەندەی کۆمپیوتەری ئای بی ئێم بوو، لە ڕووی نرخیشەوە نیوەی نرخی ئەو بوو!

لە ساڵی ١٩٨٨ واتە: دوای چوار ساڵ لە دامەزراندنی کۆمپانیای دێڵ، کاری لەگەڵ کڕیارە گەورەکاندا کرد، هاوکات لەگەڵ کۆمپانیا حکومییەکانیشدا کاری دەکرد، لەو ماوەیەدا توانی ٣٠ ملیۆن دۆلار کۆ بکاتەوە، دوای ئەوەی کۆمپانیاکەی بووە کۆمپانیایەکی نێودەوڵەتی.

کۆمپانیای دێڵ، بارەگای سەرەکی لە شەقامی ڕاوند ڕوك لە ویلایەتی تەکساسە، بووەتە بنکەیەکی سەرەکی بۆ ژمارەیەکی زۆر لە خزمەتگوزارییەکانی کۆمپیوتەر، ئێستا دێڵ یەکەم کۆمپانیایە لەسەر ئاستی جیهان، کە دەتوانێت خزمەتگوزاری پێشەکەش بە بەکارهێنەرانو کڕیارەکانی بکات لە ڕووی خزمەتگوزاری بنچینەییو درووستکردنی ژێرخانی ئینتەرنێتو تەکنەلۆجیای زانیاری، کۆمپانیای دێڵ بەپێی لیستی گۆڤاری فورچن، یەکێکە لە باشترین ٥٠٠ کۆمپانیاکانی جیهان!

کۆمپانیای دێڵ گەیشتووە بە ئاستێك لە بازاڕدا، کە بەردەوام هەوڵ دەدات کوالێتی باشترو خزمەتگوزاری زیاتر پێشکەش بە کڕیارەکانی بکات، ئەوەش لە ڕێگەی فرۆشتنی بەرهەمەکانیو زیادکردنی خزمەتگوزارییەکانیو لەسەر بنەمایەکی پتەوو دامەزراو.

**مایکڵ دێڵ بوو بە بچووکترین بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیای دێڵ، لە لیستی باشترین ٥٠٠ کۆمپانیاکانی جیهاندا،** کە گۆڤاری فورچن دەستنیشانی کردبوون، کە ئەو کات مایکڵ دێڵ، تەمەنی بیستو حەوت ساڵ بوو، تا ئێستاش سەرۆکی کۆمپانیای دێڵە، کە خاوەنی زۆرترین ماوەیە سەرۆکایەتی کۆمپانیایەك دەکات لە بواری کۆمپیوتەردا.

ئێستا کۆمپانیای دێڵ، بەپێی سەرژمێری گۆڤاری فۆرچن لەسەر ئاستی جیهان، چوارەم کۆمپانیای جیهانە!

لە ساڵی ١٩٩٩ کتێبێکی دانا بەناونیشانی (ڕاستەوخۆ لە دێڵەوە)، ئەو ستراتیژییەتانەی کە تازەترین هەنگاوی بەرەو پیشەسازی نا) کە زۆرترین فرۆشی تۆمار کرد، لەو کتێبەدا چیرۆکی سەرکەوتنی کۆمپانیاو ئەو ستراتیژییەتانەی کە دای هێناوەو سەرجەم کۆمپانیاکان جێبەجێی دەکەن، باسکردووە، مایکڵ دێڵ بەرپرسی هێڵی ئینتەرنێتە لە کۆڕبەندی ئابووریی جیهانی.

بە لیژنەیەکی جێبەجێکار کار دەکات، دێڵ ئەندامی ئەنجوومەنی کرێکارانی ئەمریکایە ، هەروەها پۆستی سەرۆکی پرۆژە ڕامیارییەکانی



ڕێکخراوەکانی کۆمپیوتەری هەیە، هاوکات لە ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری بۆ سەرۆکی ئەمریکی بۆ زانیاریو تەکنەلۆژیا کار دەکات، هەروەها ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی کۆلێژی کرێکارانی هندییە.

* لە ساڵی ١٩٩٠ کۆمپانیای دێڵ ناوەندێکی کردەوە بۆ وەبەرهێنان لە ئێرلەندا، بۆ خزمەتگوزاری بازاڕی ئەورووپیو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئەفریقا.

* لە ساڵی ١٩٩١ کۆمپانیای دێڵ، یەکەم کۆمپیوتەری لاپتۆپی پێشنیار کرد.

* ساڵی ١٩٩٢ کۆمپانیای دێڵ بۆ یەکەمجار چووە ڕیزی گەورەترین پێنج سەد کۆمپانیا جیهانەکانەوە، بە پێی گۆڤاری فۆڕچن.

* ساڵی ١٩٩٣ کۆمپانیای دێڵ چووە ڕیزی باشترین پێنج کۆمپانیاکان لە بواری وەبەرهێنانو دروستکردنی کۆمپیوتەردا لەسەر ئاستی جیهان.. سەرەتای کۆمپانیای دێڵ بۆ دەستبەسەراگرتنی بازاڕەکانی باسیفیكو ئاسیا بوو، لەڕێگەی کردنەوەی لقی کۆمپانیاکە لە ئوستralیاو یابان. لەگەڵ ئەوەشدا دێڵ لە چارەکی یەکەمی ساڵی ١٩٩٣ زیانو خەسارەتی خۆی ڕاگەیاند، بەهۆی فرۆشتنی کەلوپەلەکانی بە ڤیستی مانگانە. ئەمەش بووە هۆی لەدەستدانی نازناوەکەی بۆ ئەو ساڵە!

* لە ساڵی ١٩٩٥ پشکی کۆمپانیای دێڵ لە ٥،٨ دۆلارەوە بۆ سەد دۆلار بەرز بووەوە.

* لە ساڵی ١٩٩٦ ناوەندێکی وەبەرهێنانی لە دەوڵەتەکانی باسیفیكو ئاسیا کردەوە لە مالیزیا، سەرەتا کڕیارەکان لە ڕێگەی هێڵی ئینتەرنێتەوە دەستیان کرد بە کڕینی کۆمپیوتەری دێڵ بەم ناونیشانە (www.dell.com).

* لە ساڵی ١٩٩٧ کۆمپانیا هەستا بە شەحنکردنەوەی ملیۆنان ئامێری کۆمپیوتەر بۆ هەموو جیهان، بەمەش نرخی پشکەکان لەو ماوەیەدا گەیشتە ١٠٠٠ دۆلار، هاوکات کۆمپانیای دێڵ بوو بە یەکەم ڕێکخراو بۆ کارپێکردنی وێستگەکانی تایبەت لەو بوارەدا.

* ساڵی ١٩٩٨ کۆمپانیا هەستا بە فراوانکردنی ناوەندنی وەبەرهێنان لە ئەمریکاو ئەوروپادا، هەروەها ناوەندێکی بەرهەمهێنانی لە چین کردەوە، هەروەها کۆمپانیا مەڵبەندێکی دیکەی لە ئەمریکا لە شاری ناشڤیلی لە ساڵی ١٩٩٩ کردەوە، کە لە ڕیزبەندیی ناوەندە گەورەکانی کۆمپانیای دێڵ، بە پلەی دووەم دێت.

* کۆمپانیای دێڵ ناوەندێکی لە ئێلدواردو دو سو لە بەرازیل کردەوە؛ بۆ خزمەتکردنی هاوڵاتیانی ئەمریکای لاتین.

* لە ساڵی ٢٠٠٠ فرۆشی کۆمپانیای دێڵ تەنها لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە ڕۆژانە گەیشتە ٥٠ ملیۆن دۆلار!

* بۆ یەکەمجار کۆمپانیای دێڵ پلەی یەکەمی وەرگرت لە بواری شاحناتو وێستگەی کارکردن.

* کۆمپانیای دێڵ هەستا بەبەرهەمهێنانی ئامێرێکی موقەلەمی پاوەرئاپ **PowerApp**، پاوەرئێدج **PowerEdgw** لە هەمان ساڵدا کێشەیەکی تەکنیکی لە بەرهەمەکانی دێڵ ڕووی دا، ئەوەش بوو بە هۆی دابەزینی پشکی کۆمپانیا بۆ ئاستی ٥٨ دۆلار لە مانگی مارسەوە تا ١٦ دیسەمبەری هەمان ساڵ.

* لە ساڵی ٢٠٠١ کۆمپانیای دێڵ بۆ یەکەم جار پلەی یەکەمی بەدەستهێنا لەسەر ئاستی پشکی بازاڕەکانی جیهان، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمپانیا نزیکەی ١٧٠٠ کرێکاری لەسەر کار دوور خستەوە؛ لەبەر دابەزینی ئاستی فرۆشتنی کۆمپیوتەری لاپتۆپ کە ڕێژەکەی ٥،٤٪ کرێکارانی کۆمپانیا بوو.

* لە ساڵی ٢٠٠٢ دێڵ ناوەندێکی وەبەرهێنانی لە ئوستن کردەوە، بە ناوی ناوەندی وەبەرهێنانی توبفر، پاشان کۆمپانیا هەڵسا بە بارکردنی ٢ ملیۆن جێبەجێکار لە هێڵی پاوەرکونێکت **Power Connect** تایبەت بە کلیلی تۆڕەکان، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کڕیارە ئەمریکییەکان بەرهەمەکانی دێڵیان هەڵبژارد، لەبەرئەوەی کۆمپیوتەری دێڵ پلەی یەکەمی بەدەست هێنا.

* ساڵی ٢٠٠٣ کۆمپانیا هەڵسا بەبەرهەمهێنانی ئامێری چاپ بۆ کۆمپانیاکانو کڕیارەکان، پاشان ناوی کۆمپانیاکەی لە دێڵەوە گۆڕی بۆ کۆمپانیای دێڵو هاوبەشەکانی، ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی کە کۆمپانیای گواستەوە بۆ کارکردن لە بواری ئەلکترۆنییەکانی دیکەدا، لەوانە ئامێرەکانی چاپو تەلەفزیۆن، دوای ساڵانێك لە خاووخلیچکی، کە کۆمپیوتەری لاپتۆپ بەخۆیەوە بینی.

* ئەمڕۆ دێڵ یەکێکە لە گەورەترین پێگە بازرگانییەکانی ئینتەرنێت لە جیهاندا، کە سەرقاڵی کارکردنە بە پشتبەستن بە کارپێکردنی ویندۆزی نوێی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت.

* لە کاتی کارپێکردنی لە ڕێگەی سێرڤەری دێڵ پاوەر ئیدج، تۆڕی کۆمپانیای هەر سێ مانگ جارێك زیاتر لە یەك ملیار داواکاری هەیە، پێگەکان تایبەتن بە ٨٠ دەوڵەت بە ٢٨ زمانو ٢٦ جۆر دراو.

کۆمپانیای دێڵ بە ڕەهایی ئینتەرنێتیان کارایە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان لە نێویاندا کڕینو فرۆشتنو بەڕێوەبردنو پەیوەندییەکانیان، لە ڕێگەی پێگەی کۆمپانیاوە، کڕیار دەتوانێت ئەو ئامێرەی دەیەوێت دەستنیشانی بکات، تایبەتمەندیی ئامێرەکە نرخەکەی لە ڕێگەی هێڵی تایبەت بە کۆمپانیاوە بەتەواوی دەست دەکەوێت، هەروەها کڕیار دەتوانێت ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە داوای هەر ئامێرێك بکات، کە دەیەوێت، هەروەها بەدواداچوونی داواکارییەکەی بکات، لە دروستکردنییەوە، تا ئەو کاتەی بەدەستی دەگات.

هەروەها دێڵ لە ڕێگەی پێگە ئەلکترۆنییەکەیەوە **valuechain.dell.com** ئاڵوگۆڕی زانیاری دەکات لەگەڵ کڕیارەکانی، لە نێویاندا کوالێتی بەرهەمو داهێنانەکانیان، هەروەها کۆمپانیا ئینتەرنێت بەکار دەهێنێت لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ کڕیارەکانیان بەتایبەت بواری وەبەرهێنان، بۆ نموونە: سەدان هەزار کڕیار لە سەرانسەری جیهاندا گرێبەستی کڕین ئەنجام دەدەن لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە.

* لە ساڵی ٢٠٠٣ لە نێوان ١٠ کۆمپانیای جیهانیدا، بە باشترینیان هەڵبژێردرا، لە ڕووی ناوبانگی باشو متمانەی گەورە لای کڕیارەکانی، بەپێی ئەو تیروپشکەی کە ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت ئەنجامی دابوو.

هەروەها چەند جارێك مایکل دێڵ خەڵاتی ڕێزلێنانی پێبەخشراوە، وەکو سەرۆکێکی نموونەییو ناوازە، لە ساڵی ٢٠٠١ گۆڤاری (چیف ئیزکیوتف) وەکو باشترین بەڕێوەبەری جێبەجێکاری ساڵ هەڵی بژارد، هەروەها لە ساڵی ٢٠٠٣ گۆڤاری فۆڕچن وەکو یەکێك لەو کەسانەی کە زۆرترین کاریگەرییان هەبووە بەسەر جیهانی کارکردنەوە هەڵبژێردرا، هەروەها (فاینانشیاڵ تایمز) پلەی چوارەمی پێبەخشی، وەکو باشترین سەرکردەو ڕێزدارترینیان لەسەر ئاستی جیهان، هاوکات گۆڤاری (ئنستتیوشنال ئینفزیتور) وەکو باشترین بەڕێوەبەری جێبەجێکار لە بواری ئامێرو کەلوپەلی کۆمپیوتەردا هەڵی بژارد.

لە ساڵی ٢٠٠٤ مایکڵ دێڵ دەستی لە پۆستەکەی واتە: بەڕێوەبەری جێبەجێکار کێشایەوەو لە جێگەی خۆی کیفن ڕولینزی دانا، تەنها پۆستی سەرۆکی کۆمپانیا بەڕێوە دەبات.

دێڵ خاوەنی ٥٤٨٠٠ فەرمانبەرە لە سەرانسەری جیهاندا.

**چەند ڕاستییەك لەبارەی (مایکل دێڵ)ەوە:**

* سەروەتەکەی دەگاتە ١٨ ملیار دۆلار.

* یەکێکە لە ٦٩١ ملیار دێرەکانی جیهان.

* یەکێکە لەو بیست کەسەی کە تەمەنیان پێش ئەوەی بگاتە چل ساڵ بوونەتە ملیار دێر، هەروەها لەو بیست کەسەش لە هەموویان دەوڵەمەندترە.

# بۆ ژیانێکی باشتر

زریان مەحموود

### دەتانەوێت ژیانتان بگۆڕن؟

نوقمبوون لە ژیانی ڕۆژانەدا، کارێکی زۆر ئاسانە، قوتابخانە تەواو دەکەین، هاوسەرگیری دەکەین، خێزان بنیات دەنێین، دەبین بە خاوەنی منداڵ، نازناوی دایك، یان باوکمان پێ دەبەخشرێت، لەو نێوانەدا، هێندە سەرگەرمی ژیان دەبین، لەبیرمان دەچێت کە خۆمان دەتوانین ژیانی دڵخوازمان بسازێنین. گرنگ نییە تەمەنتان چەند بێت، ئێوە ئەو ئیرادەیەتان هەیە کەژیانتان بگۆڕن. ئێمە لێرەدا ٧ خاڵ نیشان دەدەین تا بەیارمەتیی ئەوان ئەو ژیانەی کەئارەزوی دەکەن بیسازێنن:-

**١- بەبیری خۆتان بهێننەوە لە منداڵیدا چ کارێکتان حەز لێ بووە؟**

منداڵان بەباشی دەزانن کە لەکام کارانەدا بەباشی کار دەکەن، ئەوان لە پەیوەندیی ڕاستەوخۆدان لەگەڵ توانا زاتییەکانیانداو لەبارەیانەوە بچووکترین گومانیشیان نییە. منداڵان ڕاستگۆیانە ئەو شتانەی کە حەزیان لێیەو ئەوانەی کەحەزیان لێ نییە بەزمان دەهێنن، لە هیچ شتێكو لەهیچ کەسێك ناترسن.

**٢- لیستێك لە لێهاتوویی‌و شارەزاییەکانتان ئامادە بکەن:-**

لیستێك لە هەموو ئەو شتانەی کە بە درێژایی ژیانتان فێریان بوون، ئامادە بکەن. هەرکاتێك کە شتێکی نوێ تاقی دەکەینەوە، شارەزایی نوێش بەدەست دەهێنین. هەندێك لەم لێزانیانە ئەگەر ڕاهێنانیان لەسەر نەکەین، بەتێپەڕبوونی کات لەدەستیان دەدەین، بەڵام لێزانییەکانی تر، وەکو فێربوونی پایسکیل لێخوڕینە، هەمیشە لەگەڵماندایە. کاتێك کەزانیتان چۆنچۆنی ئەنجامی بدەن، تواناتان بەخێرایی دەگەڕێتەوە، زۆربەی کات بەیەك زەردەخەنە! لیستێك لەوەی کە دەیزانن‌و دەتوانن ئەنجامی بدەن ئامادە بکەن. لەم کارە زۆر سەرتان سوڕدەمێنێت، لەبەرئەوە تاقی بکەنەوە. کاتێك کە بە ئەم لیستە سەرسوڕهێنەرەی تواناکانتان سەیر دەکەن‌و هەموویان لەلای یەکدا دادەنێن، لەوانەیە ئەوانە ئەو ئیمکانە بەئێوە بدەن، ژیانی دڵخوازتان بنیاد بنێن! ئەگەر مەودای نێوان زانین‌و تواناکانتان، ئێوە لەگەشتن بەژیانی دڵخوازتان دوا دەخات، بڕۆنە دەرەوەو ئەوەی کە پێویستە فێری ببن. ئەگەر پێویست بوو، تەنانەت بگەڕێنەوە بۆ قوتابخانە.

**٣- ئامانجی زێڕین هەڵبژێرن:-**

ئایا دەزانن ئەو کەسانەی کە ئامانجەکانیان دەنووسنەوە، لەو کەسانەن کە بەئەگەری زیاد بەئامانجەکانیان دەگەن. ئەم ڕایە بەتەواوی درووستە. یەك کاری سادە، هەروەك نووسینی ئەوەی کەدەتانەوێت، ئێوە بەئامانجەکانتان نزیکتر دەکاتەوە. لەسەر پایەی بابەتەکانی خوارەوە ئامانجەکانتان بنیاد بنێن، ئەو ئامانجانەی کەدیارییان دەکەن دەبێت خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە بن: قابیلی دەستڕاگەیشتن بێت تا ڕادەیەك، لەچوارچێوەی ئەنجامدا بێت (واتە: قابیلی ئەنجامداری بێت)، لەچوارچێوەی کاتی دیاریکراودا ئەنجام بدرێت.

**٤- ڕۆژانەیەك درووست بکەن:-**

ئەگەر نازانن کە دەتانەوێت چی بنووسن. سێ لاپەڕەی تەواو،



بەختی ئاسایی، یەکەمین شتەکانی هەر ڕۆژێك کە دەتانەوێت ئەنجامی بدەن هەر سەر لەبەیانییەوە بنووسن، تەرکیزتان لەسەر بابەتەکە لا نەدەنو نەوەستن، تەنانەت ئەگەر ناچاربوون چەندین جار بنووسنو بنووسنەوە «نازانم چی بنووسم». هزری نیوە هۆشیارتان بەئارامی ئەوەی کە لەقووڵایی وجودتاندا مۆڵ داوە، دەردەخات. ئەمە دەتوانێت تاڕادەیەك یەك ڕاهێنانی بەرچاو بێت. لەوانەیە لە ڕۆژانی سەرەتادا زۆر جێگای ڕازیبوون نەبێت، بەڵام ئەگەر بەردەوام بنو زۆر ماندوو نەبن، دونیایەك لەدەروونتاندا دەدۆزنەوە کە غافلگیرتان دەکات. نووسینەکان بپارێزن، نیشانی کەسیان مەدەن. ئەمانە بیرەکانی ئێوەنو پەیوەندییان بەکەسێکی ترەوە نییە. تەنها ئەگەر بزانن کە چیتان دەوێت، هەرئەوە یارمەتیتان دەدات کەژیانی دڵخوازتان بسازێنن. تاقی بکەنەوە دڵنیابن کە نرخی ئەوەی هەیە.

**٥- باوەڕ بەخۆتان بهێنن:-**

ئێوە ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەکانتانن «ئێوە هەمان ئەو شتەن کەبیری لێ دەکەنەوە». زەینی ئێمە زۆر بەتوانایە. خۆتان ڕابهێنن کە تەنها بیر لەو شتانە بکەنەوە، کە دەتانەوێت، ئەسڵەن بیر لەوانە نەکەنەوە کە ناتانەوێت. ئەو توانایە بیرکردنەوەی پۆزەتیڤە. وین دایر دەڵێت: «هەرشتێك کەلەگەڵیدا دژیت، بێ هێزت دەکات. هەر شتێك کەلەگەڵیدا هاوڕایت، بەهێزت دەکات، هەمیشە لەبیرتان بێت، ئێوە ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەکانتانن.

**٦- بۆ بەردەوامیی ڕێگاکە، ئازایەتیتان هەبێت:-**

بە ئاراستەی خەونەکانتان بڕۆن، تەنانەت ئەگەر وەکو منداڵێکی تازەپێگرتووش لارەلار بکەن. تەنها بەردەوام بنو نائومێد مەبن. سەرکەوتن لەگۆشەیەکدا چاوەڕوانی ئێوەیە. پەندێکی ژاپۆنی دەڵێت: «ئەگەر حەوت جار کەوتی، بۆ جاری هەشتەم هەستەوە سەرپێ». ئەگەر نەکەوین فێر نابین بڕۆین بەڕێگادا. هەندێك کات، بچووکترینەکان بۆ ئێمە ئومێد بەخشترینەکانن.

**٧- لەبیرتان بێت کە هیچ شتێك هەمیشەیی نییە:-**

هەموو شتێك لەسەر زەویدا کاتییە، ناچار نین لەکارێکدا کە ئارامیو دڵخۆشی ئێوە لەناو دەبات بمێننەوە. هەرشتێك لەژیانتاندا بابەتێکە بۆ گۆڕانکاری، ئێوەش دەتوانن کەسێك بن کە ئەوشتە دەگۆڕن، ئەڵبەتە ئەگەر خۆتان بتانەوێت. ئێوە دەتوانن ئەو ژیانە بسازێنن کە دەتانەوێت. بەدرێژایی ژیانتان هەمیشە فێرخواز بنو بەدوای فێربووندا بڕۆن. بۆ هەر زانیاریو فێربوونێك، لەهەر گۆشەو کەنارێکدا تامەزرۆ بن. بەم شێوەیە لەوانەیە ئێوە تەمەنێکی پڕ سەمەرترو ئیحساسی ڕەزایەتی زیاترتان هەبێت. لەوانەیە لەڕێگادا تووشی ناڕەحەتیو سەختی ببن، بەڵام ئەگەر ئامانجێك هەڵبژێرن، تەرکیزی پۆزەتیڤتان لەسەری هەبێت، باوەڕ بکەن کە سەرکەوتو دەبن، تەنها بەردەوامی پێ بدەن، دەگەن بەو ژیانەی کە ئارەزوی دەکەن، ئەم باوەڕە لای خۆتان درووست بکەن.



# ئاشتی

ئاوات ئالانی

وەرن با خەم بەجێ بێڵین، ڕوو بکەینە سەرای شادی
مەلی ناو قەفەزی سینە، تامەزرۆیە بۆ ئازادی

با بە کلیلی تەبایی، دەروازەکانی شەڕ داخەین
لە پێشوازی ژینی نوێدا، فەرشی ئەوین بۆ دڵ ڕاخەین

جوانی لەجەنگا ئەژاکێ، کێ خێری لە شەڕ بینیوە
ئاشتی ماڵی خەونەکانە، تەم پەنجەرەکەی تەنیوە

مەگەر پێنووس زاری نییە، با لە جیاتی چەك بێتە گۆ
با لێوی دڵ خەندە بگرێ، تاکەی گریان لە سەر گڵکۆ

بۆ لە نیشتیمانی منا، یا ڕەوە، یاخود ڕۆڕۆیە
بولبولەکان مەتارێنن، زامی دڵی گوڵ بەسۆیە

ئەوەی ژیرە ژیانی خۆی نابەخشێ بە تاجری شەڕ
ئەزانێ کێ خەباتکارەو کێ خیانەتکاری بەدفەڕ

# دیاریی نائاشنا

ئەسکەندەر ڕەحیم



لە زانکۆیەکی مالیزیا، مامۆستای وانەی کۆمەڵایەتیو کۆمەڵناسی، مەرجێکی دانا لەسەر فێرخوازەکانی؛ بۆئەوەی لە بابەتەکەیدا، دەربچنو نمرەی تەواو بەدەست بهێنن.. مەرجەکەش بریتی بوو لەوەی، کە هەر فێرخوازێك لە سێ فێرخوازەکەی ئەو گرووپە، لە ماوەی چوار مانگی وەرزی یەکەمی خوێندندا، مرۆڤێك لە دەرەوەی خانەی خزمو خێزانی، کەسێك دڵخۆش بکات، لە کۆتایی وەرزی خوێندنیشدا، بە بەڵگەی ڤیدیۆیی، کارەکەی، بۆ هەموان بخاتە ڕوو.

مامۆستا هەر بەم دەسپێشخەرییە ڕانەوەستا، بەڵکو لەگەڵ کۆمپانیایەیەکی مالیزیدا ڕێککەوت، تا سپۆنسەریو سەرپەرشتیی ئەم گەلاڵەو پرۆژەیە بکاتو وەك ڕێزلێنانێك ١٠٠٠ دۆلار ببەخشێت، بە هەر یەکە لە ١٠ باشترین براوەو دەسپێشخەر.

لە کۆتایی وەرزی خوێندنەکەدا، سێ فێرخوازەکە، نمرەی تەواویان بەدەست هێنا، پاش ئەوەی لە هۆڵی شانۆی زانکۆ، سەرجەم کارەکان خرانە ڕوو، باوانی فێرخوازەکان ئامادەبوون، هاوپۆلەکان باشترین ١٠ کارو دەسپێشخەرییان دەستنیشان کرد.

ئەم دەسپێشخەریو ڕچەشکێنییە مرۆییانە، کە پڕبوون لە هیواو گەشبینی، لە سەرتاسەری مالیزیادا دەنگی دایەوە.

دیارە هەر یەك لە فێرخوازەکان، دەیویست کارێکی مرۆڤانەی جیاواز ئەنجام بداتو لە ڕوخساری کەسی بەرامبەردا، بەختەوەری بکێشێتو بنەخشێنێت.

ئەو فێرخوازەی کە یەکەمی پێشبڕکێکە بوو، دەسپێشخەرییەکەی بەم جۆرە بوو: فێرخوازە مالیزییەکە، ڕۆژانە، دیارییەکی بچووکی لە بەردەرگای ژووری فێرخوازێکی بەشە ناوخۆییەکەیدا دادەنا، کە خەڵکی هیندستان بوو، باوکی ناردبووی بۆ مالیزیا؛ بۆئەوەی لە کۆلێژی پزیشکی بخوێنێت.

فێرخوازە یەکەمەکە، لەبەرئەوە ئەو فێرخوازە هیندییەی هەڵبژاردبوو؛ چونکە هەستی کرد، لەم دوورە وڵاتییەیدا، نە هاوپۆلێکی هاوڕێیەتی دەکات، نە بزەیەك دەخاتە سەر لێوانی، نە قسە لەگەڵ کەس دەکات، نە کەسیش دەیدوێنێت، هەمیشە غەمبارو بێتاقەت دیار بوو. ئەم هۆکارانە وای لە فێرخوازە مالیزییەکە کرد، کە فێرخوازە هیندستانییەکە، بە باشترین کەس دابنێت، تا هەوڵی دڵخۆشکردنی بدات. یەکەم دیاریی ئەو فێرخوازە، بریتی بوو لە: نامەیەکی بچووکی بێناوو بێواژۆو خستیە ژێر دەرگای فێرخوازە هیندییەکەو تێیدا نووسیبووی: منیش پێم خۆش بوو، وەکو تۆ، ببم بە پزیشك، بەڵام من لە وانە زانستییەکاندا لاواز بووم، خودا زیرەکییەکی پێ بەخشیویت؛ تا بەهۆیەوە، بەشداری لە دڵخۆشکردنی مرۆڤایەتیدا بکەیت.

ڕۆژی دواتر، فێرخوازە مالیزییەکە، کڵاوێکی مالیزی کڕیو لەگەڵ نامەیەکدا، لە بەردەرگای ژووری فێرخوازە هیندییەکەدا دایناو لە نامەکەدا نووسیبووی: هیوادارم، ئەم کڵاوەت پێ پەسەند بێت.

لای ئێوارە، فێرخوازە مالیزییەکە، فێرخوازە هیندییەکەی بینی کڵاوەکەی کردووەتە سەرو بزەو بسکە لە پەڕەی ڕوخساری دەبارێتو پێشتر بەو جۆرە نەبینرابوو.. هەر هێندە نا، بەڵکو تەماشای هەژماری فەیسبووکی فێرخوازە هیندییەکەی کردو وێنەی یەکەم نامەو کڵاوەکەی بڵاو کردبووەوە.. جوانترین شتێکیش کە بینی، سەرنجی بابی فێرخوازە هیندییەکە بوو، کە نووسیبووی: تەنانەت هاوزانکۆییەکانیش، بە پزیشکێکی بلیمەت، تۆیان دێتە پێش چاو، ڕۆڵەگیان، نەکەیت قسەیان بە زەویدا بدەیت، بێهیوایان بکەیت.. سا لەبەرئەوە بەردەوام بە.

ئەم سەرنجە، وای لە فێرخوازە مالیزییەکە کرد، کە ڕۆژانە، بەبێئەوەی ناونیشانی خۆی، بۆ فێرخوازە هیندییەکە بنووسێت، لە نامەنووسینو پێشکەشکردنی دیارییە بچووکەکان بەردەوام بێت.

بزەی لێوو بسکەی شادیی فێرخوازە هیندییەکە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، گەورەتر دەبوو، هەژماری فەیسبووکو تویتەرەکەشی، پڕبوون لە هاوزانکۆییو پرسیار: ئەمرۆ چی ڕووی داوە؟ چیی نوێ هاتووەتە پێش؟ خێرا پێمان بڵێ.. دەمانەوێت بزانین، دیاریی ئەمرۆ چییە؟

ژیانی فێرخوازە هیندییەکە، بەهۆی هاوزانکۆییە مالیزییەکەوە، لە کە سێکی گۆشەگیرو دڵتەنگەوە، بەتەواوەتی گۆڕا، بۆ کەسێکی کۆمەڵایەتی لێوبەخەندە.. پاش تێپەڕبوونی دوو مانگ بەسەر دیاریو نامەکاندا، فێرخوازە هیندییەکە بوو بە باسوخواسی زانکۆ، لە کۆڕێکی کۆمەڵایەتیدا، کە بۆ فێرخوازانی زانکۆ ساز کرابوو، داوا لەو فێرخوازە کرا، ئەزموونی خۆی بگێڕێتەوە. فێرخوازە هیندییەکە لە بەردەم هاوزانکۆییەکانیدا، لەبارەی دیاریو نامەکانەوە قسەی کرد، باسی یەکەم نامەی کرد، کە وای کرد، لە بڕیاری وازهێنان لە کۆلێژی پزیشکی دەست هەڵبگرێتو ئەو بەربەستە کەلتووریو ئەکادیمیانە تێبپەڕێنێت، کە دەهاتنە سەر ڕێی.

محەممەد شەریف کە فێرخوازە مالیزییەکەیە، بەهۆی ئەو کارە بچووکەی، کە کردی، ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە ژیانی فێرخوازە هیندییەکەدا؛ چونکە ڕۆژێك دادێت، دەبێت بە پزیشكو ژیانی دەیان کەس ڕزگار دەکات.. ئەم چاکەیەش، لە پاش خودا، هی ئەو کەسەیە، کە بەهۆی نامەیەکی دڵسۆزانەوە، بەئەسپایی گەردو غوباری غەمی سەرشانی ئەو فێرخوازەی تەکاند!

ئێمە بارانین، هەموو دەشتو دۆڵەکان ئاو دەدەین بە خوێنەکانمان، ئێمە سەربازینو جەنگەکان لەناو دەبەین، خۆری پرشنگدارینو پشکوێنەری گوڵەکانین، ڕووناکینو تاریکی لەبەین دەبەین، هاوڕێینو خەمی دڵەکان دەتوێنینەوە، دەریاینو بێدەنگی کەنارەکان تێك دەشکێنین، هەموو شتێکی خراپ لەناو دەبەین، بەڵام بەداخەوە، باشترین شت پارێزگاری لێ ناکەین، لەناوی دەبەینو لەبیری دەکەین، ئێمە لەم کاتەدا دەبین بە لاستیکو خۆمانو مێژووشمان دەسڕینەوەو گەرماینو کلۆبەفرەکانی ڕابوردوومان دەتوێنینەوە، ئێمە بووین بەو دەمارانەی لەش، کە پەلاماری خانەکانی خۆی دەداتو لەناوی دەباتو بووین بە براکانی یوسفو براکەمان دەخەینە نێو بیرەوە، تەورەکانینو بنەچەی خۆمان دەبڕینەوە، بووین بە گەردەلوولو ڕەگو ڕیشەی چەند ساڵەی چێنراومان دەردەهێنین، بووین بە دووکەڵو هەناسەکانی ڕابوردوومان پیس دەکەین... ئێمە مانای (کورد) بوونمان دەتوێنینەوە!! بۆچی؟! چونکە بیرمان چووەتەوە، کە کوردینو مێژوومان هەیە؛ چونکە چەندین زاناو پرۆفیسۆرو پێگەیشتووی گەورەمان هەیە، کەچی ئامادەنین خزمەتی نیشتیمانو لانەیی خۆمان بکەین، بەڵکو لەوڵاتانی تر خەریکی خزمەتکردنو خۆماندووکردنن، ئایا نیشتیمانەکەی خۆت تەواو پێشکەوتووەو پێویستی بە تۆ نییە؟ ئایا کوردستان شایەنی ئەوە نییە خزمەتی بکەیت؟ لە پێناویدا ماندوو ببیت؟ بەداخەوە تەنها کەمێك لە هەستی نووسەرو شاعیرانی ڕابوردوومان تێدا نییەو هەستی کوردایەتیمان تواوەتەوە. ئەگەر سەیری هەر لایەك، هەر شەقامێکی نیشتیمان بکەین؛ دەبینین کە پێویستمان بە هەموو تاکێکی کورد هەیە، کە خزمەت بکەنو پێکەوە قۆڵ هەڵبماڵنو پێکەوە بەرەو پێشکەوتن بڕۆین، ڕاستە ئەوانیش مرۆڤنو چاکە لە هەموو شوێنێك هەر چاکەیە، بەڵام لە ڕاستیدا، ڕووناکی بەرەو ئەو شوێنە دەڕوات، کە تاریکی لێ بێت. دەی بۆچی ئێوە بەپێچەوانەی ئاراستەی ڕووناکی دەڕۆن. دیارە وتە جوانەکانی مێژووەکەمان بیرچووەتەوە کە دەڵێن: (چەپڵە بە دەستێك لێ نادرێت)، هەموان پێکەوە تەواوکەری یەکدین...

لە ڕوویەکی دیکەوە ئێمە هەر زۆر خۆمان تواندووەتەوە، کە ئەویش ئێمە ڕۆشنبیریی خۆمان زۆر پیس کردووەو ڕۆژ بەڕۆژیش پیستر دەبێت؛ چونکە دەستەواژەی زمانە بیانییەکان بەکار دەهێنینو دەیگۆڕینەوە لەگەڵ وتە شیرینەکانی خۆماندا کەمتر بەکاری دەهێنین. هەروەها خاکە بەپیتەکەمان هەمیشە چاوی لەدەستمانە، بەڵام هەروەکو (مەجنوون) دەبێت وێڵ بێتو ئاوڕێکی لێ نادرێتەوەو زۆرینەی بەرهەمەکانمان دوورە لە دەستی کوردو خۆماڵی خۆمانەوە، هەرچەندە بەرهەمی خۆماڵی هەیە، بەڵام هەر ڕێژەکان زیاتر بەرهەمی وڵاتان لەپێشینەتر دادەنێن. ئێمە شتێکی لە هەموان گرنگترمان تواندووەتەوە، کە بەتەواویی ڕۆچووەو بۆ کۆکردنەوەی کاتێکی زۆری دەوێت، ئەویش ئەوەیە کە بۆچی تا ئێستا لە کەسمان نەبیستووە کە بە ساڵنامەی کوردی ساڵو بەرواری لەدایکبوونی خۆیی بڵێت، یاخود هەر بۆچی لەسەر ڕەگەزنامەکان نانووسرێت؟ لەڕاستیدا ئەگەر بچینە ناو بابەتی گەردوونییەوە؛ ئەوا بێگومان هەموو کاتو بەروارو ڕۆژێکی کوردی، زۆر لەوانەی کە بەکاری دەهێنین ڕاستترو وردترە، بەڵام بەداخەوە، کە زۆربەمان هەر نازانین، کە چەندی مانگی کوردییە، یاخود هەندێکمان ناوەکانیشمان لەبیر نییە، تا بگات بەوەی کە بزانین چەندی مانگەکەیە... بۆیە هیوادارم کە بەلایەنی کەمەوە، هەر کەمێك زانیاریمان لەسەر کوردبوونمانو مێژووەکەمانو بەهاکانی بوونی کوردایەتیمان هەبێتو هەموان پێکەوە دەست لەناو دەست بینو ئاوەدانیو سەرفرازی بەدی بهێنینو کوردایەتیمان نەتوێنینەوە، بەڵکو بەرەو پێشکەوتنی ببەین؛ تا کۆمەڵگای ئێستاو داهاتووش، وەك شاعیرەکانمان داخ لە دڵ نەبنو بڵێن:

فەرهاد بۆ شیرین، چەکوشی ئەوشان
بەردی ئەتاشیو بەردی ئەسووتان
ئەی بۆ فەرهادێك نەهاتە رووی کار
شیوەن بتاشێت، لە ڕووی کوردستان -قانع-



# تۆێنەری خۆمانین

سەودا مەهدی



حەمزە محەممەد کەریم

# حەوت ڕێکار بۆ ئەوەی لە ئامێزی خێزانێکی بەختەوەردا بژین

بەگشتی خێزانەکان جیاوازن، بەڵام پێویستە بەئاگاو ڕاستو درووست، یان لێبوردە بن، ماڵەوە دەبێت لانەی عیشقو خۆشەویستیو لەخۆگرتنی بیروڕای منداڵەکان بێت لە ڕووی هەستو سۆزەوە لە سەلامەتیدا بن.

ماڵ دەبێت یاساو ڕێسای تایبەت بە خۆی هەبێت، ئەمڕۆ لەبەر ئەو هەموو ناتەواویو دەردەسەرییانەی لە ماڵەکاندا هەیە، بەدیهێنانی کەشوهەوایەکی لەم جۆرە، کارێکی گرانە، ئەمەش وامان لێ دەکات، کە پێویستە هەڵوێستە بکەینو بیر لە گۆڕانکارییەك بکەینەوە؛ لێرەدا چەند ڕێکارێك هەن، کە دەبن بە یارمەتیدەر بۆ ئەو مەبەستە:

**یەکەم: چاودێریی ئەو وتانە بن، کە لە زارتان دێنەدەر:** ئێمە زۆرجار *ئەوەمان لەیاد کردووە، کە تا چەند منداڵەکانمان ڕەخنەیان لە دڵدا هەیە* بەرامبەر بە ئێمەو تا چ ڕادەیەك کاریگەرییان لەسەر درووست دەکات؟ سەرنجی جیاوازیی ئەم دوو ڕستەیە بدەن (ڕابەر ئەم ژوورەت، هەمیشە وەکو تەویلە وەهایە)و (ڕابەر ئەمڕۆ ژوورەکەت زۆر شپرزە، پێش ئەوەی بچیتە دەرەوە بۆ یاریکردن، پێویستە ژوورەکەت پاك بکەیتەوە)، یەکەم جار بە ڕابەر دەڵێت: ئەو هەرگیز ناتوانێت کاری ڕێکوپێك ئەنجام بدات، ئەوەی دیکەیان زۆر بەنەرمی پێی دەڵێت: چی بکات؛ بۆئەوەی کارەکانی ڕێکوپێك ببن، وێڕای ئەمەش ڕابەر دووبارە سۆزو خۆشەویستی دایکی خۆی لەیاد ناکات. بۆئەوەی زەمینەی ڕەخنەگرتن ساز بکەین، پێویستە کۆمەڵێك کاری گرنگ باس بکەین، کە هەندێکیان سەرەکیو هەمیشەیینو هەندێکیان لاوەکیو کاتین، ڕێگایەکی دیکەی ئامادەکراو بە مەبەستی ڕەخنەگرتن لە منداڵان ئەوەیە: یادیان بخەینەوە کە کارەکانی ئەوان، تا چەند کاریگەری لەسەر ئێمە جێ دەهێڵن.

**دووەم: ڕێکوپێكو جێگیر بن:** ڕۆژانە پێشبینی بەرنامەیەك بکەن تایبەت بە خۆتان، کۆمەڵێك ڕێساو یاسای ڕوونو جێگیر ماڵێکی ڕێکوپێك، منداڵانو دایكو باوك هەست بە کەشوهەوایەکی ئارامتر دەکەنو دەبێتە هۆی درووستبوونی هاوسەنگیی لایەنی دەروونیان، کاتێك شەڕو ئاژاوەو قەیران ڕوو دەدات، ئەو بەرنامەی کە پێشبینی کرا پێشتر، دڵنیاکەرەوە دەبێتو دەبێت بە پارێزەرێکی باش، کاتی بەیانیانی خۆتان بهێننە بەرچاو، کاتێك منداڵەکانتان بەرەو قوتابخانە دەچن، ئایا هەست بە ئارامی پشتبەخۆبەستن دەکەن، یان شپرزەو نائاساییین؟ ئەی شەوان کاتی خەوتن چۆنن؟ ئایا سەبارەت بە ئەنجامنەدانی کاری ماڵەوەی منداڵەکانتان، یان نەبوونی هاوسەنگی لە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن کێشەتان بۆ درووست بووە؟ بەرنامەیەکی ڕۆژانەی ئارامکەرەوە دابنێن، بۆ کاتی خەوتن، ئەمە دەبێت بە ڕێچارەیەك بۆ ئەو ترسەی کە منداڵ هەستی پێ دەکات، کاتێك بە تەنها خۆی لەسەر جێگەی خەو دەمێنێتەوە، لەکاتی ڕوودانی ئەم حاڵەتەدا، بەرنامەیەکی کرداری کە دوور بێت لە سۆزو خۆشەویستی، کەشوهەوایەکی گونجاو بۆ لایەنی ڕۆحی کەسێتیی منداڵەکان، ویستو ئارەزووەکانی منداڵ دەستەبەر ناکات.

**سێیەم: هەندێك لە کاتەکانتان، تەرخان بکەن، هەمووتان پێکەوە دابنیشن:** دانیشتنی خێزانی ئەنجام بدەن، بەسەربردنی کات پێکەوە لە تەنیشت یەکدی، کارێکی زۆر ناوازەیە، لەم دانیشتنانەدا، هەمووتان دەتوانن دەردەدڵی خۆتان بۆ یەکدی بکەن، بە هەمان شێوەش کارە باشەکانیش کە ئەنجام دراون بخەنە بەرباس.

**چوارەم: هەستە پڕ لە خۆشییەکانتان زیاتر گەشە پێ بدەن:** ژیان ڕۆژانێکە، زەمینەیەکی لەبارە؛ بۆئەوەی بتوانین پەیوەندییەکی خۆشیئامێز لەگەڵ منداڵەکانماندا درووست بکەین، لێکۆڵەرەکان ئەوەیان دەرخستووە، کە دایكو باوکەکان کاتێك یاری لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن، یان نوکتەو قسەی خۆشیان بۆ دەکەن، لەو کاتەدا هەموو هەستو هۆشێکیان، تایبەت دەکەن بە منداڵەکانیان، منداڵێکی نەرمونیانیان لێ درووست دەبێت.

هەرچەندە زیاتر ئێمە ڕوویان پێ بدەینو کاتی زیاتریان لەگەڵدا بەسەر ببەین، *ئەوانیش دەرك بەوە دەکەن، کە ئێمە خۆشمان دەوێن.* زۆرێك لە دایكو باوکان دەڵێن: زۆربەی کات لەگەڵ منداڵەکانماندا لەڕووی سۆزو خۆشەویستییەوە تەباین، پێکەوە لەسەریەك جێگە لەتەنیشت یەکەوە سەیری تەلەفزیۆن دەکەین، پێکەوە پیاسە دەکەین، یان پێکەوە لەڕێگەیەکی دووروودرێژ بە ئۆتۆمبێل سەفەر دەکەین، لە هەموو ئەم کاتانەدا، هەموو هەستە ئازاربەخشو ترسەشاراوەکان باس دەکرێن.

**پێنجەم: ڕێوڕەسمی تایبەت بەخۆتان بەئەنجام بگەیەنن:** پێکهاتن لەسەر دانانی کاتێکی گونجاو، ڕۆژانە، یان هەفتانە؛ بۆ کۆبوونەوە بە ناونیشانی یەك خێزان، هەستی بەردەوامیو پێکەوەبوون لەلای منداڵ درووست دەکات، خێزانی مایکڵ بەشێوەیەکی ڕێکوپێك هەموو شەوانێکی هەینی بۆ خواردنی پیتزا کۆ دەبنەوە!

**شەشەم: گۆڕانکاریی زیاتر لە دڵسۆزی نەرمونیانیدا هەڵسوکەوت بکەن:** لە دنیای ئەمڕۆدا، ژیانی خێزانەکان هەمیشە جێگیرو ناتوندوتیژ نییە، هەتا لە نموونەی باشترینی هاوسەرگیرییەکاندا دەبینیت، شەڕو قەیرانی ئابووریو هەورازو نشێوەکانی بەردەم سۆزداری بەدی دەکرێن، باوان لێك جیا دەبنەوە، ئەم گۆڕانانە پڕسۆزترین خێزان ڕووبەڕووی یەك دەکەنەوە... بەدڵنیاییەوە کێشەکان بەشێکن لە ژیانی مرۆڤەکان. ئەو خێزانانەی کە لە ئاستێکی باڵادان لە ڕووی خۆشەویستییەوە بێبەش نین لەو کێشانە، بەڵکو لە هەوڵی ئەوەدان، سەرەڕای هەموو ئەم کێشانە، کەشێکی سۆزداری بەهێز درووست بکەن، بۆ نموونە: کاتێك ئێمەی دایكو باوك تووشی دەمەقرەیەك دەبین، دەتوانین بەجۆرێك خۆمان دەربخەین بە منداڵەکان بڵێین هەموو شت باشە.

**حەوتەم: بەرنامەڕێژی بکەن بۆ تەرخانکردنی کاتێك، کە بەتەنها لەگەڵ هاوسەرتان پێکەوە بن:** باوان ئەو دوو کەسەن کە دەتوانن بارودۆخی ماڵەوە درووست بکەن، کاتێك لەبارەی بڕێك پارە کە قەرزارین، یان لەو کۆمپانیایەی کە کاری تێدا دەکەین، تووشی شکست دەبین، نارەحەت دەبین، یان بەهۆی هاوسەرمانەوە تووڕە دەبین، بەهەمان شێوە زۆر بەداخەوە هاوڕێیەکم وتی: (دایكو باوك دەبێت زمانێکی تایبەت بەخۆیان هەبێت، ڕێ ڕۆشتنێکی دوورو درێژ بەبێ ئامادەبوونی منداڵ؛ تا گفتوگۆی تێدا بکەین کەشێکی ئارامیمان پێ دەبەخشێت، ئەم کاتە تایبەتانە، یارمەتیی باوان دەدەن؛ تا ئەو خۆشەویستییەی کە بوو بە هۆکاری بەیەکگەیشتنمان، ئەزموونی بکەینەوە. سەرچاوە: گۆڤاری موفقیت



شۆخان عەلی

# تۆ کە خوێندکاریت کەواتە: خوێنەر بە!

وەرزێکی نوێی خوێندنی زانکۆو پەیمانگاکان، دەستی پێکردەوە، دووبارە هۆڵەکان پڕ دەبنەوە لە خوێندکار، پەڕەی کتێبەکان چیدی بەداخراوی نامێننەوە! مامۆستایانی دڵسۆز، بەتامەزرۆییەوە دەست بە وانەوتنەوە دەکەنەوە، بە هیوای ڕۆشنبیرکردنی چینە هەرەچالاکەکەی کۆمەڵگە، ئەو چینەی پێشکەوتنی کۆمەڵگای لەسەر بەندە! ئەوانیش زۆربەیان وا دەزانن خوێندن بریتییە لە: چەند پەڕەیەکی مەلزەمە، یان کتێبێکی بەردەستیان، کە ئەگەر پێویست نەبوایە لەسەریان، ئەویشیان نەدەخوێند!

هەموو هیوایەکیان بە زانکۆ، (تەواوکردنی خوێندنو دامەزراندنە، ئەویش بۆ هەبوونی مووچەیەك، هەڵبەت ئەمان تەنها هۆکارنین بۆ ئەم پشێویو سەرلێتێکچوونە، بەڵکو پەروەردەو گەشەکردن لە کۆمەڵگایەك، کە زانست تێیدا (تەنها نمرەی بەرزە!)، ڕێز واتە: (پلەوپایە!)، ڕۆشنبیری واتە: (ئەوەی ڕوخساری ڕێكو مۆدێرن بێت! یاخود بەکارهێنانی ئینتەرنێتو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان!)، یاسا (تەنها تایبەتە بە کۆمەڵە کەسانێك!)، بەکورتی هەموو ئەوەی هەیە، هەر بەو شێوەیە وەردەگیرێت، کە لە ڕوخسارەکاندا دەردەکەون! لەبەرئەوەی ناوەڕۆك، لێتێگەیشتنی دژوارو هیلاککەرە، زۆرجار نرخێکی وەهای نییە!

بەداخەوە! کۆمەڵگایەکی بێ یاساو سەرلێشێواوە، کە دەتوانین لە هەمان کاتیشدا بڵێین: فرەیاسا!، بەڵام هەموو ئەم هۆکارانەو چەندانی دیکەیش، نابێت ببن بەهۆی پاڵدانەوەو نەمانی وزەی ئێمە، وەك چۆن ئێستا حاڵی زۆربەمانە... پێویستە ئەم خەواڵووییە تەرك بکەینو بەئاگا بێینەوەو چواردەوریشمان بەئاگا بهێنینەوە؛ بۆ دروستکردنو بنیاتنانەوەی کۆمەڵگایەکی ڕۆشنبیرو پێشکەوتوو، بەتایبەت لە زانکۆکانەوە دەست پێ بکەینو کارلێکی لەگەڵ کۆمەڵگەدا پێ بکەین. با پێکەوە لەگەڵ وەرزی نوێی خوێندندا، زانکۆو پەیمانگاکان بکەین بە ناوەندی ڕۆشنبیریو توێژینەوەی زانستیو هاندانی خوێندکار بۆ بنیاتنانی کەسێتییەکی بەرهەمهێنەر لە خۆیدا، بەڵام بەداخەوە کە هۆکارەکان، تەنها خوێندکارەکان نین، بەڵکو مامۆستاکانیش هۆکارن بۆ کەمتەرخەمیو هاننەدانی خوێندکار بۆ دروستکردنی بیرو تێگەیشتنیان لە گرنگیی خوێندنو فێربوونو پەروەردەی تاکی ڕۆشنبیر؛ چونکە زۆربەی خوێندکار، بە ئومێدو هیوایەکی زۆرەوە دەچێتە ناو زانکۆو پەیمانگاکان، بەڵام لەوێ نائومێد دەبێتو دەڵێت: ئەوەی کە من بیرم لێدەکردەوەو چاوەڕێم دەکرد، وا دەرنەچوو!

لێرەدا خوێندکار ئامادەیە، بۆئەوەی ببێت بە کەسێکی بنیاتنەر، بۆ چاکسازیی کۆمەڵگەو خزمەتی زانست، بەڵام هۆکارەکان بەردەست نین، لەگەڵ ئەوەدا پاڵنەرەکانیش ونن! کەواتە: فێرخواز چۆن چالاك دەبێت؟ زۆر جار، چالاکیەکانیشیان بێنرخ دەبن، تەنها بەرزیی نمرەی تاقیکردنەوەکان دەبن بە پێوەر بۆ دیاریکردنی ئاستی زیرەکی! بێگومان ئەمەش کاریگەریی نەرێنی لەسەر خوێندکار هەیەو دیسان دەبێت بەهۆی نائومێدبوونی لە بەردەوامیدان بە هەوڵەکانی... هەرچەندە بەدەر لە خوێندکار، خۆی کۆمەڵێك هۆکاری دەرەکی هەن، بۆ نەخوێندەواریو ناڕۆشنبیری فێرخوازان لە زانکۆو پەیمانگاکان، بەڵام ئەم هۆکارانە هیچ بەربەستێك دروست ناکەن، ئەگەر تۆ لە هۆکارە بنیاتنەرەکان بڕوانیت؛ چونکە (ئەوەی کۆمەڵگا وێران دەکات خوێندەوارەکانن، ئەوەشی سەرلەنوێ بنیاتی دەنێتەوە، دیسانەوە ئەوانن!) ڕێگە مەدە هۆکارە دەرەکییەکان ڕێگا لە پاڵنەری ناخت بگرن، هەوڵ بدە چاکسازی بکەیت، دڵنیا بە زۆرینە لەگەڵ تۆدایە... هەمیشە هەوڵی بوێری بدە، ئەگەر ویستت، لە دژوارترین کاتدا، کارێکی ڕاست بەئەنجام بگەیەنیت، هەوڵی خۆت بدە، (تۆ ئومێدت هەبێت، خودا هەرگیز بێئومێدت ناکات). بە خوێندنو پلانی تۆ، دەکرێت کۆمەڵگایەك سەرلەنوێ بە کۆمەڵێك بیری جیاوازو نوێو بنیاتنەرەوە دروست ببێتەوە. ئەگەر تۆ ڕۆشنبیر بیت؛ دەتوانیت ڕووناکی لە بیری نەتەوەیەکدا بڕوێنیت... ئاشکرایە تۆ کە منداڵ بوویت، ئاواتت گەورەبوون بووە، لە پیریشدا گەڕانەوە بۆ گەنجی! دەی ئێستا کە گەنجیت، هەوڵ بدە ئەوەی دەتەوێت، بەدەستی بهێنیت. زۆرکەس هەمان خەونی تۆیان هەیە، بەڵام بە بیرۆکەی جیاواز، ئەگەر ئامانجەکەت لای خەڵکی ڕوون بێت، ئەوانیش ڕەنگە هەمان ڕێگەی تۆ بگرن؛ چونکە هەمان خەونیان هەیە. زانکۆ بۆ کۆکردنەوەی زانستو تاکی کۆمەڵگەیە پێکەوە، بۆ دروستبوونی کۆمەڵگایەکی ڕۆشنبیرو خوێنەرو زانستخوازە، تۆش هەوڵ بدە هەموو ئەوانە کۆ بکەیتەوەو پێکەوەیان گرێ بدەیت، تۆ کە خوێندکاریت، کەواتە: خوێنەرو بنیاتنەر بە!



# لە چاوەڕوانی تۆدا!

بۆ چاوەڕوانیی تۆ، گوڵی باخچەکان ئەم بەرەبەیانە، بە شەونم ڕوخسارییان پاك دەشۆن، شەقامەکان بۆنی مێخەکی تەڕو گوڵەباخ دەگرن، خاکی ژێر پێت، بۆنی میسكو شەوبۆ دەگرێت، بەڵام لەگەڵ گەیشتنتدا، هەموو بۆنی تۆ دەگرن!

لە دووریٚ ڕا، مزگێنی بۆ یاقوبی دڵ دێو کراسی یوسفی خەڵات دەکات بۆ دیدەی هەمیشە چاوەڕوانی!

ئای لە ئانو ساتی ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ﴾ یوسف: ٩٤ لە دوای دەیان ساڵ گریانو دابڕانو هیجرانو ناڵەو سووتانو تاسەو گەڕان!

لەو یوسفە پرسیومە لە بێگانەو یاران
هەرگیز نییە سۆراخی لە هیچ لاوە دڵی من -بێخود-

دوای سەدان شەوی تەنیاییو گریانی نیوەشەوو هاوارو ناڵەی سەحەر! هاوار لە دەست گڕی دیوارو عەزابی دووری!

ئەتلێتەوە گاهێ بە خەیاڵی خەتو خاڵی
ئەخولێتەوە گاهێ بە چرای شەوقی جەماڵی
نازانی ئەگەر چۆنە بە دەس دەردەوە حاڵی
وەك پووشو پەڵاشێکە، بەدەم باوە دڵی من -بێخود-

تەشریفی تۆ، تەشریفی ڕۆحو مەقدەمی حەیاتە،

لەدایکبوونێکی نوێو ژیانێکی فیردەوسییە!

چوون خۆ هەموو مرۆڤەکان، ڕۆژێك هەردەبێت تامی مردن بچێژن، وەلێ زۆر کەمن ئەوانەی کە تامی ژیانیان کردووە!

بێگومان ئەوەی نەگات بە ئەمینداری ڕۆحو شازادەی مەملەکەتی ئەوینو خەزنەداری دڵ، هەرگیز تامی ژیان ناکات!

لە تاسەی دیداری تۆدا، ڕۆح لەگەڵ هەموو هەناسەیەکدا دەهاتە سەر لێو، گەر وادەی هاتنی تۆ نەبا، دەمێك بوو ماڵاوایی کردبوو!

سەعدی شیرازی دەڵێت: ئەی یار، ڕۆح هاتۆتە سەر لێو بۆت!
چی دەفەرمووی؟ بگەڕێتەوە، یا دەربچێ!؟

بە هاتنت کۆتایی بە سووتانو هەڵقرچانو شینی سەحەر دێنی.

ماڵێکە هەموو وەقفە لە شەوقی سەری کوڵمت
عومرێکە هەموو سەرفە لە ناڵینی سەحەردا -وەفایی-

ئیدی لەگەڵ مەولانادا، بە خەم دەڵێم: دەرچۆ لە دڵ ئەی خەم، وا لوتفی یار بەڕێوەیە!

ئیدی هەموو ڕۆژەکانی تەمەن جەژنە، نەك تەنها ڕۆژێکی ساڵ!!

عەیامێکە چاوەڕێتمو سەرم داناوە لە ڕێتا؛ تا بەسەریدا گوزەر بکەی..

وا سەرم دانا بە عەزمی بەردەبازی ڕێگەکەت
مەرهەمی دەردی سەری من، وا بە گەردی پاتەوە -ناری-

ئیدی کاتی هاتنی سۆمای چاوو خۆری ئاسمانی ژیانە، هەنگاوەکانت ئاوازی ڕۆحە، چرپەی دەنگت سروودو دروودی گیانە، دەنگی هەناسەت، بزەی لێوت لەزەتێك بە ڕۆحم دەبەخشێ کە جگە لە سروەیەکی بەهەشتی، نازانم چی ناوێکی دی لێ بنێم! لەوێدا بۆ یەکەمجار، دڵ دەگاتە ئۆخەی!!

چ شیرینە لەگەڵ شەهدی حزورا
لە تۆ خەندەو لە من ئاوازی ئۆخەی -ناری-

ئەوە ئەو ساتەیە، کە لە دەریای جوانیتا دەتوێمەوەو ئیدی ون دەبم!

ئەو کاتەیە لەبەر تیشکی چرای ڕوخسارتا، چاوەکانم دادەخەمو تەنها بە چاوی دڵ دەڕوانم!

ئەو ساتەیە هەموو لاشەم دەبنە گوێو دڵۆپ دڵۆپ شەهدی وتەکانت، بە ناخی دڵما ڕۆدەچن!

ئای چەندە تامەزرۆی دیدارو گوفتارت بووم!؟

وا عاشقی زارو کەمەری تۆیە وەفایی
لەو نێوە وجودێکە لە بەینی دوو عەدەمدا

ئەویندار نەبێ، کێ ئاگای لە دڵی منە، پەروانە نەبێ کێ هەست بە هەڵقرچانم دەکا، بولبولی دوورلەگوڵو شەیدای کۆنە ژوانو هەواری خاڵی نەبێ، کێ دەزانێ تاسەو دووری، یانی چی!؟!

بە تەنیا گیانەکەم سۆزی دڵم پەروانە دەیزانێ
خەمی دڵ، بولبولێکی بێگوڵو بێلانە دەیزانێ -نیمامی-

دڵخۆشبە هەموو خەونەکانم موژدەم پێدەدەن، هەموو نزاکانم سوکنایی دەبەخشن بە دڵم، ئێستا فرمێسکەکانم، خۆیان ڕوومەتم بۆ دەسڕن!

تەنها لەوە دەترسم، لە باوەشی گەرمی تاسەمدا بتوێیتەوە، لە گڕی ناخم دەترسم، لەو ئاگرەی کە عەیامێکە دەمسووتێنێ!

بۆ ئەو ڕۆژە پێویستم بە هەموو زمانەکانی دنیایە، پێویستم بە وشەی نێو هەموو فەرهەنگەکانە؛ تا بتوانم گوزارش لە خۆشەویستیم بکەم!

پێویستم بە گوڵی هەموو باخچەکانی جیهانە؛ تا چەپکێکی لێ بکەم بە دیاری بۆ تۆ!

بەڵام دڵنیام جگە لە گوڵی نێو فیردەوس، هیچ گوڵێك شایانی تۆ نییە!

نیگەرانم، دەترسم، شازادەکەم لە گەورەییتا ونبم! ئیدی نەمبینی! دەترسم تۆش لە بچووکیمدا ونبیو دەستم نەگاتە دامێنت!

من ناتوانم بەرامبەرت بدوێم، ناتوانم سەر بڵندکەم!

دەمەوێت چیرۆکم بۆ بگێڕیتەوە، حەکایەتی خۆش، خۆشتر لەوانەی دایکم!

دەمەوێت یاریم لەگەڵ بکەی، زۆرتر لە یارییەکانی منداڵیم!

دەمەوێت فێری وێنەکێشانم بکەی، وێنەی گوڵ، وێنەی بەفر، وێنەی چۆلەکە، وێنەی کەروێشك!!

دەمەوێت سەرلەنوێ ئەلفوبێی ژیانم بۆ بنوسی، منیش دوابەدوای تۆ، لە پەڕاوێکی سپیدا ڕاهێنانی لەسەر بکەم!

دەمەوێت دەستەکانم بگری!

من لەسەر دەستی تۆ لەدایك دەبمەوە، فێردەبم، زمانم دەپژێ، پێدەکەنم، چاوەکانم هەڵدێنم!

لە ئامێزی بەهەشتا، بە زمانی گوڵ بمدوێنە، شەوانە بە لایلایەی دایکانە بمخەوێنە، پڕ سینگم بکە لە بۆنی خۆت، غەرقی نوورم بکەو دڵۆپێك لە دەریای جوانیتم پێ ببەخشە، ئەی تاقانەی ڕۆحم!

ئیدی هەرگیز جارێکی دی، مەڕۆو مەملەکەتی ئەوین جێ مەهێڵە!!

گەرمیانی

دڵنیایی نابێتە هاودەمی ڕۆح، ئاسوودەیی نابێتە ساکینی مەنزڵی دڵ، تا بەتەواوی تەسلیمبوون، جڵەوی دینو ژینت، تەسلیم بە خودای گەورە نەکەیت!

ئەو کاتەی هەموو کاروباری ژیانت، دەدەیتە دەست خودا، ئەو کاتە دڵنیا دەبیت، کە هەموو کارەکانت، بەدەست ئەونو ئەویش بە حیکمەتو ڕەحمەتو میهری بێسنوورەوە، مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات!

ئیدی هەرگیز خەم نابێتە میوانی دڵە پاکەکەت!

ئەو کاتەی پشت بە خودا دەبەستیتو لەژێر سایەی پڕمیهرو سۆزی ئەودا، پشوو بە ڕۆحت دەدەی، ئیدی خەمو پەژارە، هەرگیز ڕێگای دەروونت نادۆزنەوە!

خوداوەند، داوامان لێ دەکات، دەست بەهێزی ئەوەوە بگرینو تەنها خۆمان بهاوینە نێو دەفەری میهری ئەوو جگە لەو، پشت بە کەس نەبەستین؛ چونکە جگە لەو خوداوەندە گەورەیە، یارو یاوەرو یارمەتیدەرێکمان نییە!

جا چی سوڵتانو مەولاو پاڵپشتو هێزدارو یارمەتیدەرێك لە "الله" باشترە؟!

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ﴾ الحج: ٧٨

کەسێك ڕووگەی خودا بێتو هێزی ئەژنۆو بڕبڕەی پشتی، تەسلیمبوونو دەستگرتن بێ بە هێزی خوداوە، ئیدی سەرکەوتنو سەرفرازی، دەبنە هاودەمی هەمیشەییو دەبێتە ڕێبواری ڕێگای نوورو هیدایەت.

﴿ وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ ال عمران: ١٠١

چونکە کاتێك خودا دەکەی بە وەکیلی خۆت، ئیدی ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴾ النساء: ٨١

کاتێك خودا دەکەی بە سەرچاوەی ڕزقو ڕۆزیو بەخشندەیی بێسنووری هەموو خەڵاتەکان، ئەوا تۆ، ئیدی قەیرانێك نییە، هەڕەشە لە ئابووریت بکات؛ چونکە خودای تۆ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ﴾ الذاريات: ٥٨

کاتێك پشتی پێ دەبەستی، ئەو خودایە بەردەوام دەتبینێو دەتبیستێو ئاگای لە هەموو ڕازونیازێکتە، بە هێزو دەسەڵاتو زانستو بیستنو بینینی، لە هەموو شوێنێ لەگەڵتایە ﴿ وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ ﴾ الحديد: ٤

ئازیزم: دەستگرتن بەهێزی خوداو پشتبەستن بەخودا، دەبێت سەرەتا تەوەککولو تەسلیمبوون بێت بە وەحیی ئیلاهیی، کە قورئانو سوننەتی پەیامبەرە «سڵاوی خودای لێ بێت».

دینی خودا، هەمووی تەسلیمبوونو ئیعتیصامو دەستگرتنو ملکەچبوونە!

بە کردارو بە گوفتارو بە نیەتو بە ئامانجو بە ئیخلاسی تەواوو شوێنکەوتنی پەیامی پێغەمبەرەوەو بەردەوامبوون لە سەری، تا ڕۆژی لیقای ئیلاهی!

تەماشای باوکی پێغەمبەران ئیبراهیم بکە «سڵاوی خودای لێ بێت»، کاتێك خوداوەند، فەرمانی تەسلیمبوونی پێ دەکات، چی دەفەرموێت؟!

﴿ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ البقرة: ١٣١

تەسلیمبوون بە خودا، واتە: ڕووگەی مەبەستت، تەنها خودا بێت، جگە لە خودا، مەبەستو مەرامت، بە کەس نەبێت.. چاوەڕێی لوتفی کەسو دەستی کەسو فەیزی کەس نەکەی، جگە لە خودا!

ویستت، ئیرادەت، تکاو داواو نزاو حەزو ئارەزووت، ترسو خۆشەویستیو ئاواتو هیواکانت، هەموو دابێ بە خودا، خوداو بەس!

گەر ئەوەت کرد، ئیدی پشتێنت بکەوەو لەژێر داری بەختەوەریو ڕاحەتی ڕۆحدا، بە تەواوی ڕاحەت، پشوو بدە!

ئیدی خەمی چیتە؟ کە دەزانیت **"ولا يكون إلا ما يريد"** وەکو ئیمامی تەحاوی لە عەقیدەکەیدا دەفەرموێت!

ئیدی لە کێ دەترسیت؟ کە دەزانیت، کاتێك خودا بیەوێت، تووشی خێرێکت بکات، کەس ناتوانێت دەستی بگرێ!

﴿ وَإِن يُرِدۡكَ بِخَيۡرٖ فَلَا رَآدَّ لِفَضۡلِهِۦۚ ﴾ يونس: ١٠٧

لە هەندێ ئەسەردا هاتووە، کە خودای گەورە فەرموویەتی: «بەندەکەم، داوام بکە، دەمگەیتێو من بەدەست دێنی، ئەگەر منت بەدەست هێنا، ئیدی هەموو شتێکت دەستکەوتووە، ئەگەر منیشت لەدەست چێ، ئەوا هەموو شتێکت لەدەست داوە»!

ئازیزی من، لەوە باشتر چییە، کە تۆ ئیدی کلیلی خەزێنەی دڵت بدەی بە خوداو خەمی هیچت نەبێت!

دڵنیابیت لەوەی، ئەوەی کە دەتەوێت، لە خودی خۆت زۆر باشتر، بۆت ئەنجام دەدات.

کاتێك کارێکت بۆ دەکات، یاخود بەپێچەوانەوە بۆت ناکات، ئەوە لەبەر حیکمەتێکە، کە تەنها خۆی دەزانێت!

ئێمە هەرچەندە وێڵی سوودو بەرژەوەندی خۆمان بین، تەنها ڕووکەشی ڕووداوەکان دەبینین، بەڵام خوداوەند جیهانی غەیبو پەنهانی لێ دیارەو ئەوەی ئەو دەیزانێو دەیبینێ، ئێمە نایزانینو نایبینین!!

﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢١٦

خاوەنی هێزو دەسەڵاتێکی هێندە بێسنوورە، هیچ شتێك لە فەرمانی دەرناچێت!

ئیدی بۆ بە تەواوی تەسلیمبوون، خۆمان تەسلیم بە خودا نەکەین؟

تا خوداوەند، لە ڕیزی باوەڕداراندا هەژمارمان بکاتو پاداشتو خەڵاتی گەورەمان بۆ دابنێ:

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾

النساء: ١٤٦

مەرجی سەرەکیی ئیعتیصامو تەسلیمبوونیش، بەردەوامبوونە لەسەر ئەم شارێگا ڕاستەو دەستبەردارنەبوونی ئەم پەیامە پیرۆزەیە، تا ئەو ڕۆژەی بە باوەڕەوە دەگەڕێینەوە دیوانی خودا.

# لەگەڵ لوتفی شاعیردا



شاعیر ناوی شێخ لەتیف شێخ ڕەزا بەرزنجییە، ساڵی ١٩٠٥ لە دێی "پەڵکانە"ی ناوچەی قەرەحەسەن لەدایك بووە.

شاعیر وێڕای ئەوەی هەر لە منداڵییەوە چووەتە بەر خوێندنو تا ئاستێکی بەرز لە خوێندنی مەلایەتیدا ڕۆیشتووە، بەڵام بەهۆی بارودۆخی ژیانەوە، نەیتوانیوە ئیجازەی مەلایەتی وەربگرێت، بەڵکو زۆربەی ژیانی بە کشتوکاڵو کەسابەتەوە بەسەر بردووەو ژیانێکی هەژارانەو پڕ لە چەرمەسەرێتیی هەبووەو هەرچەندە لە شێخانی بەرزنجە بووە، بەڵام شێخانە نەژیاوە، بەڵکو وەکو خۆی دەڵێت:

لەبەر دەستکورتیو هەم ئاخرشەڕی.. سەگی کائینات، گشت بە من وەڕی

لوتفی ساڵی ١٩٨٩ کۆچی دوایی کردووە.

چاوەکانت بۆتە باعیس ئەشکی ڕوونی چاوەکەم
تیغی ئەبرۆت باعیسە، بۆ مەنعی خوردوو خاوەکەم
غەمزەکانت هەروەکو تیرە، لە دڵ تەئسیری کرد
بۆتە مەنعی خواردنو خەو، ژینو نانو ئاوەکەم

زەمانێکە ئەڵێم یاڕەب، بەدەرخەی شۆخی جانانم
کەبێتو دەرکەوێ بۆ من، هیلالی جەژنی قوربانم
ڕجام وایە، ئەمن خالیق لە بۆ دەرمانی دەردی دڵ
حەکیمی حازقی خۆم بێ، بکا دەرمانی دەردانم
بە شمشێری دوو ئەبرۆی خۆی، ڕژاندی خوێنی جەرگو دڵ
بە جەردەی پەرچەمو زوڵفی، ئەمن وا خانەوێرانم
لە تاریکیی شەوی زوڵفی، لەدەستم چوو خەزێنەی هۆش
بە چەرخی ڕوومەتی ئاڵی، ئەسیری چەرخی دەورانم
سوورەییای گەردنی ئەو بوو، چرای دڵمی کە وا کز کرد
تریشقەی تیری جادووی بوو، کە خانەی سەبری ڕووخانم
کە ئەستێرەی ڕوخت ون بوو، بزربوو لێم هەموو ڕێگە
بە ئەجمی ڕوومەتی ئەو بوو، دەلیلی ڕێی بیابانم
بە غەمزە پێی وتم: (لوتفی)، بەسە تاکەی جەفای بێسوود
جەوابی یەئسی دا دەستم، کەوا فرمێسکە بارانم
*  *  *  *  *  *  *  *
دڵ وەکو ڕاوچی ئەویش وا بۆتە کارئاسکی خەتا
من خەتاکارم لە بۆیە، بۆتە مانیع ڕاوەکەم
بێخەبەر وەك وەحشی وا بووم، هەر ئەسووڕام دەشتودەر
هەروەکو تەیری لەناکاو، تووشی دانو داوەکەم
پەیڕەوی قەیسی بێچارە، لازمە بۆ من ئیتر
هەر ڕەفیقی وەحشی دەشتیو دووریی دایکو باوەکەم
سەد وەکو لوقمان کە بێتو کوا ئەکا دەرمانی دڵ
دیدەنی ئەو کافییە؛ بۆ زامی جەرگو ناوەکەم
بەس تەمەع (لوتفی)بکە دونیایی دوون باقی نییە
هەم بخۆ، بۆ مردنی خۆت، کوانێ تۆپی چاوەکەم
*  *  *  *  *  *  *  *

**لوتفی خاوەنی قسەی نەستەقو شیعری گاڵتەئامێزیشە لەو شیعرانەش:**

مامە خلە سوارە لەسەر کەرێکی دێزە
مەعلوومە لە کەرەکەی، خۆی زیاتر بەهێزە
هەگبەیەکی بچووکی وا لە بندایە دیارە
بە عەقڵی من وەهایە، هەگبەکەی پڕ لە گوێزە
بە لاونیوی سواربووە، کڵاوی داناوە لار
لەلای خۆی وایە، عەینەن حاکمەکەی تەورێزە
جار بە جارێ بە لەقە لێی ئەخوڕێ بەتوندی
ئەڵێی ڕۆستەمی زاڵە، سواربووە لە شەودێزە
کەوای چادر، لەبەر کوڵەباڵێکی دڕاو
دەرپێی جاوە مەعلووم کراس ساغو بێزە
کە دێتە سەر گفتوگۆ، ئەوەن توندو مەغرووره
وەکو تفەنگە ڕەشکە، دەرمانی لەسەر تێزە
جەستەی تەرتیب دراوە بە ئەنواعی حەماقەت
لە دوو دەنیا بێ خەبەر، لەگەڵ کەری ئامێزە
وا ئەزانێ کەس نییە لە ژێر ئاسمانی خوا
کە مەجلیس بگری خۆیو فاتەی ژنی بەڕێزە
(لوتفی) ئەگەر پێی بڵێ، ڕێگەی حەقو عەدالەت
وەك ماری مانگی نیسان، حازرو شەڕەنگێزە